# فیکری سیاسی شیعە

لەنێوان

# شوراو ولایەتی فەقیهدا

وەرگێران و ئامادەکردنی
علی حسین

# فیکری سیاسی شیعە

لەنێوان

# شوراو ولایەتی فەقیهدا

وەرگێران و ئامادەکردنی

علی حسین

بسم الله الرحمن الرحيم

# پێشەکی

خوێنەری هێژا..

ئـەم بابەتـەی لـێرەدا دەیخوێنیتـەوە، خولاسـەیەکە لـە کتێبێـک بەناونیشانی (تطور الفكر السياسي الشيعي من الشورى الى ولاية الفقيـه) کە لەلایەن زاناو ڕۆشـنبیرێکی نـاوداری شیعەوە دانـراوە (احمـد الکـاتب) کتێبەکە دانراوێکی نوێیـەو چـاپی یەکەمـە لەسـەرەتای سـاڵی (١٩٩٧)دا دەرچووە لەلایەن (دار الشورى للدراسات والاعلام) کە بارەگاکـەی لـەندەن - پایتەختی بەریتانیایە.

لەلایەن هەمان دەزگاوە گۆڤـارێک دەردەچێت بـەناوی (الشـورى) کـە نووسەری ئەم کتێبە سەرنووسەریەتی. قـەبارەی کتێبەکـە (٤٤٨) لاپەڕەیـە. بابـەتی سـەرەکی کتێبەکـە بریتی‌یـە لـە توێژینەوەیـەکی مێژوویـی فیکـری سیاسی شیعە بەگشتی‌و شیعەی ئیمامی بەتایبەتی..

دانـەری کتێبەکـە بەشێوەیەکی زانستی‌یانەو، بـە پشـت بەسـتن بـە سەرچاوە گرنگ‌و باوەڕپێکراوەکانی شـیعە خۆیـان لەسەرتاسـەری مێـژوودا، توانیویەتی پەنجە بخاتە سەر خاڵە لاوازەکانی فیکری سیاسی شیعەو چەند ڕاسـتی‌یەکی زۆر گرنگـی لـەو بـوارەدا ئاشـکرا کـردووە . بەشـێوەیەکی زۆر جەریئانەو، بە بەڵگەوە ڕوونی کردووەتەوە کە ئەهلی بـەیتی پێغەمبـەر ﷺ ئیمامی عەلی‌و شیعە لەسەدەی یەکەمی کۆچی‌دا باوەڕیان بە مەبدەئی شورا هەبووە لە هەڵبژاردنی خەلیفەو پێشەوادا لەلایەن موسڵمانانەوە.

پاشان بەجوانی ڕوونی کردۆتەوە، کە نظریەی ئیمامەت‌و دوانزە ئیمـام‌و ئیمامی مەهدی کـە ئیمـامی دوانزەهەمـە چۆن هاتنـە کایـەوەو چۆن ئـەو هـەموو لادان‌و دانـراوە ئەفسـانەیی‌یانە هەڵبەسـتراون‌و بـوون بـە عـەقیدەو حەقائیقێک کە ئەمڕۆ ملیۆنەها مرۆڤ باوەڕیان پێی هەیەو دەوڵەتی لەسەر بنیاد دەکرێت.

لە کۆتایی‌دا هاتۆتە سەر باسی نظریەی ولایەتی فەقیهـ کە ئیمام خومەینی باوەڕی پێی هەبووەو کۆماری ئیسلامی ئێرانی لەسەر دامەزراندووەو، چۆن ئیمام خومەینی لە کۆتایی ژیانیدا بەشێوەیەکی موتڵەق مومارەسەی ولایەتی کردوەو پێی وابووە کە وەلی فەقیهـ جێگری ئیمامی مەعصومو پێغەمبەری مەزنەو بۆچوونو ئیجتیهادەکانی لەسەرو دەستوورو ئیرادەی ئوممەتەوەیەو صبغەیەکی دینی موقەدەسی هەیەو، ئوممەت واجبە لەسەری کە فەرمانبەرداری لێ بکات بەبێ سەر لێ کردنەوەو ڕەخنەگرتنو نارەزایی دەربڕین. بەمەش مێژووی حوکمی ثیوقراتی زیندو کردۆتەوە کە پاپاکانو قەشەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ناهەموارترین شێوازی دیکتاتۆریەتی دینی‌یان بەسەر گەلانی ئەوروپادا سەپاند.

لەبەر گەورەیی کتێبەکەو گرنگی بابەتەکانی لە هەمان کاتدا بەپێویستمان زانی کورتی بکەینەوەو خۆلاسەیەکی سوودبەخشی بخەینە بەردەستی خوێنەرانی زمانی کوردی، بەو هیوایەی کەلێنێکی بچکۆلە لە کتێبخانەی کوردی‌دا پڕ بکاتەوە.

# بەشی یەکەم

# نظریەی ئیمامەتی ئەهلی بەیت

ئەگەر بە وردی سەرنجی سەردەمی ژیانی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفەکانی راشدین بدەین، بە ڕوونی بۆمان دەسەلمێت کە کۆمەڵی موسڵمانان ئیمانیان بە شوورا هەبووە، بەوەی کە ئوممەت مافی دیاریکردنی خەلیفەو فەرمانڕەوایانی خۆیان هەبووە.

لەسەر ئەم بنچینەیە بووە کە پێغەمبەری مەزن ﷺ لە کۆتایی ژیانی خۆیدا کەسێکی دیاری نەکرد بۆ جێنشینی خۆی و خەلافەتی خۆی. کاتێک هەندێ لە هاوەڵەکانی بەتایبەتی نزیکەکانی خۆی وەک عەباسی مامی و عەلی کوڕی ئەبو تالیب داوایان لێ کرد کەسێک دەستنیشان بکات بۆ ئەوەی بیناسن و دوای خۆی گوێی بۆ بگرن، بەڵام بۆی دیاری نەکردن و پێی ڕاگەیاندن کە ئەوە مافو دەسەڵاتی موسڵمانان خۆیانە کەسێک دیاری بکەن.

هەر لەم ڕوانگەیەوە زانایان و بیرمەندانی ئیسلامی ڕایان وایە کە پێغەمبەر ﷺ لە ژیانی پێغەمبەرێتیدا چەند جۆرە وتەو هەڵس و کەوت و ڕەفتاری هەیە، هەر جۆرێک بە ئیعتبارێکو هەڵوێستی تایبەتی بەرامبەر هەیە لەلایەن موسڵمانانەوە:

جۆرێک بەو ئیعتبارەی: کە مرۆڤێکە وەک هەموو مرۆڤەکانی تر، خواردن و خەوتن و هەڵس و کەوتی خۆی هەیە، مەرج نیە کە موسڵمانان پابەند بن بە هەموو ئەو هەڵس و کەوت و ڕەفتارانەوە، بەڵکو بەپێی توانای خۆیان هەوڵ ئەدەن شوێن پێی هەڵبگرن و لاسایی بکەنەوە.

جۆرێکی تر بەو ئیعتبارەی: کە پێغەمبەر بووە و لەلایەن خواوە وەحی بۆ دێت و تەبلیغی موسڵمانان دەکات و ئەبێ گوێڕایەڵ و پابەند بن بە فەرمان و ڕاسپاردەکانیەوە.. بەڵام ئەم سیفەتەی (واتە سیفەتی پێغەمبەرێتییەکەی) بە وەفات کردنی کۆتایی پێ هاتووە و نەگوێزراوەتەوە بۆ هیچ کەسێک لەدوای

خۆی ، چونکە کە پێغەمبەری خاتەم بووە. کەواتە زنجیرەی پێغەمبەرایەتیو پەیوەندی بوون بە ئاسمانو گشت ئەو مەسەلانەی کە پەیوەندداران بەو سیفەتەوە وەک: (وەحیو عیصمەتو موعجیزە) کۆتایییان پێ هاتووەو لەلایەن پەروەردگارەوە ڕاگیراوەو بۆ کەسێکی تر نیە لاف بەو شتانەوە لێبدات.

جۆری سێهەم: لە هەڵسو کەوتو گوتارو ڕەفتاری پێغەمبەری خۆشەویست بەو ئیعتبارە بووە کە حاکمو فەرمانڕەوای موسڵمانان بووە. بێگومان ئەو هەقە دوای خۆی دراوەتەوە بە ئوممەت و، مافی ئەوەیان هەیە کە بەڕێگای شوراو ڕاوێژکاریەوە فەرمانڕەوای خۆیان دیاری بکەن، بەلای کەم جێگەی ڕەزامەندی زۆرینەی موسڵمانانو نوێنەرانیان بێت.

هەر لەسەر ئەم ئەساسە بوو کە موهاجرینو ئەنصار ڕاستەوخۆ دوای ڕاگەیاندنی وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ پێش تەواو کردنی ڕێو ڕەسمی ناشتنو بەخاک سپاردنی تەرمی پیرۆزی، ڕوویان کردە سەقیفەی بەنی ساعدەو لەوێ دوای مشتو مڕو مشاوەرەیەکی گەرم ، ئیمامی ابوبکری صدیقیان بە خەلیفەو فەرمانڕەوای خۆیان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەتی سلامی هەڵبژارد ، واتە کرا بە فەرمانڕەواو سەرۆکی دەوڵەت. بەم شێوەیە هەریەکە لە چوار خەلیفەکەی ڕاشدین بە هەڵبژاردن لەلایەن ئەهلی حەلو عەقدی موسڵمانانەوە دیاری دەکرانو لەلایەن موهاجرینو ئەنصارەوە بەیعەتیان پێ ئەدراو سەرجەم موسڵمانانی ناوچەکانی تری دەوڵەتی ئیسلامی پێیان رازی دەبوون.

هەر لەبەر ئەم هۆیە بوو ، کە سەردەمی ئەو چوار خەلیفەیە ناسراوە بە سەردەمی خەلیفەکانی راشدین. کەواتە لەلای سەرجەم موسڵمانان بە ئەهلی بەیتی پێغەمبەریشەوە، هەموو کۆک بوون لەسەر ئەوەی کە دیاریکردنی خەلیفەو فەرمانڕەوای موسڵمانان بەشوراو هەڵبژاردنو ڕەزامەندی ئوممەتەو کەس مافی ئەوەی نیە ئەو هەقە لە ئوممەت بسەنێتەوە کە خوای

پەروەردگار پێی بەخشیوەو پێغەمبەرو خەلیفەكانی راشدین بە كردار ئەنجامیان داوەو لەسەری رۆیشتوون.

## شورای خەلیفەتی ئەهلی بەیتی پێغەمبەر ﷺ

ئێستا با بزانین ئەو راستییە گەورەیە دوای سەردەمی خەلیفەكانی راشدین چ گۆڕانێكی بەسەردا هات؛ لەدوای شەهیدبوونی ئیمامی عەلی كوڕی (ابو طالب)، بنەماڵەی بەنی ئومەییە بەسەرۆكایەتی (موعاویەی كوڕی ابو سفیان) توانیان خەلافەت بگرنە دەستو، پایتەختی دەوڵەتیان لە شاری مەدینەوە گواستەوە بۆ شام و، (معاویە) دوای خۆی یان دەتوانین بڵێین هەر لە ژیانیدا (یەزیدی كوڕی) كردە وەلی عەهدو جێنشینی خۆی و، بەیعەتی بۆ وەرگرت بەزۆر یان بەرازی كردن، بەم شێوەیە رەوشەكە گۆڕاو خەلافەت بە عەمەلی كرا بە میراتیو رۆڵی ئوممەت كەم كرایەوە لە دیاری كردنی كاربەدەستانی خۆیدا.

### لەكاردانەوەی ئەم گۆڕانكارییەدا:

جێی وتنە لێرەدا ئاماژە بەو راستییە بكەین كە هەرچەند ئەمەویەكان خەلافەتیان كرد بە میراتی ، بەڵام تەنها لەرووی كردارەوە ئەو لادانە سەپێنراو درێژەی پێ دراو، هەرگیز رۆژێك لەرۆژان لەرووی شەرعیو (نظري )یەوە نەیانتوانی (تأصیلو تنظیر )ێكی ئەوتۆی بۆ بكەن كە ببێتە هۆی ئەوەی لەرووی فیكریو شەرعییەوە جێگیر ببێت.. چونكە زانایانی ئەهلی سوننەتو جەماعەت بە هیچ شێوەیەك لەو بوارەدا پشتگیرییان لێ نەكردن، جگە لە رازی بوون بە ئەمری واقیع، ئەویش لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندی باڵای ئوممەتو راگرتنی خوێن رشتنو دانەرووخانی هێزو دەسەڵاتی دەوڵەت لەبەرامبەر دوژمنانی ئیسلامدا (ئەهلی سوننەتو جەماعەت).

بەڵام برایانی شیعە بەپێچەوانەوە چەندەها دەقو فەرمودەو بەڵگەی عەقڵیو رپوایەتو چیرۆكی سەرسوڕهێنەریان دەرهێناو لەرووی فیكریو

(نظری )یشەوە ئیمامەتیان بەشێوەیەکی میراتیو عەمودی لەبنەماڵەی (حسینی کوڕی عەلی) جێگیر کردو، بوو بە بەشێکی بنەڕەتی دین لەلایان. هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە لەڕووی کردارەوە نەیانتوانی خەلافەت بگرنە دەست ، بۆیە پەنایان بردە بەر ئەو (تأصیلو تنظیر)ە لەڕووی دینیو عەقڵیەوە بۆ جێگیر کردنی خۆیانو بەرگری کردن لەبەرامبەر لایەنی دەسەڵاتدارەوە کە ئەمەوییەکانو پاشان عەباسییەکان بوون و، تا ئەمڕۆش درێژەی پێ دەدرێ.

هەندێ لە شیعە (ئەوانەی کە لایەنگری ئیمامی عەلی بوون لە کێشەی نێوان ئیمامی عەلیو مەعاویەدا) ، وتیان خەلافەت مافی ئەهلی بەیتی پێغەمبەرەو ئەمان لە ئەمەوییەکان لەپێشترنو هەق وایە بەدەست ئەمانەوە بێت و، لە نەوەکانی ئەمان دەرنەچێ. بەڵام ئەم نظریەی ئەهلی بەیتە گشت شیعە نەبوو لە سەدەی یەکەمی هیجریدا. چونکە چەندەها دەقو فەرموودەی نەقڵ کراو هەیە هەر لەلایەن شیعە خۆیانەوە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە پێغەمبەر ﷺو ئیمامی عەلیو ئەهلی بەیت بەگشتی باوەڕیان بە مەبدەئی شوراو مافی ئوممەت هەبووە لە دیاری کردنی پێشەوایانی خۆیاندا.

لە ڕیوایەتێکدا کە (الشریف المرتضی) -یەکێکە لە ناودارترین زاناکانی شیعە لە سەدەی پێنجەمی کۆچیدا- دەیگێڕێتەوە کە عەباسی کوڕی عبد المطلب لەکاتی نەخۆشیەکەی پێغەمبەردا ﷺ داوای لە ئیمامی عەلی کرد کە پرسیاری لێ بکات ، داخۆ دوای خۆی کێ کاروبار دەگرێتە دەست ؟ ئەگەر لە ئێمەیە (واتە لە ئەهلی بەیت) با بزانین وەئەگەر لە غەیری ئێمەیە با گوێڕایەڵیی بکەین، ئیمامی عەلی خوای لێ ڕازی بێت دەڵێت: چووینە لای پێغەمبەر ﷺ کاتێک نەخۆشی زۆری بۆ هێنا، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا، خەلیفەی دوای خۆتمان بۆ دیاری بکە. لەوەڵامدا فەرمووی: نەخێر، دەترسم ئێوەش وەک بەنی ئیسرائیلتان بەسەر بێت، کە

چۆن له هاروون دوور کەوتنەوەو یاخی بوون، بەڵام ئەگەر نیــاز چاکەو چاکە ویست بن ئەوا خوا بۆتان ئاسان دەکات).

کەواتــە پێغەمبــەری خۆشەویســت ﷺ کەسێکی لـەدوای خـۆی دەست نیشان نەکردوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە مافی ئوممەتــەو خۆیـان لـەڕێگای شوراوە لەسەر کەسێک ڕێک دەکەون .

گشت مێژوو نووسەکانی سوننەو شیعە لەسەر ئەوە کۆکـن کـە ئیمـامی عـەلی لەسەرەتاوە دڵگران بوو بە هەڵبژاردنی حەزرەتی (ابوبکـر)و بەیعـەتی پێ نەکرد تا ماوەیەک. بێگومان دواکەوتنی ئیمامی عەلی لەو مەســەلەیە، دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ:

**یەکەم:** ڕەنگە خۆی وا دانابێ کە شایستە تـرە بـۆ ئـەوەی موسـڵمانان هەڵی بژێرن بە خەلیفە.

**دووەم:** وای دەزانی دەبوایە بەشدار بکرایــە لـە مشـاوەرەو عەمەلیـەی دیاری کردنی خەلیفەداو بێ ئەو ئەو کارەیان ئەنجام نەدایە.

دیارە ئیمــامی عــەلی سـەرگەرمی مەراسیمی شـۆردنو ئامـادەکردنی تەرمی پێغەمبەر ﷺ بووەو نەیتوانیوە ئامادەی ئەو کۆنگرەیە ببێت کە لـە سەقیفەی بەنی ســاعدە بەسـترا بـۆ هـەڵبژاردنی خەلیفـە. بۆیـە ڕووی کـردە موسڵمانەکانو وتی: وەنەبێ قەدرو پایەی (ابوبکر) نـەزانم، بـەڵام وا دەزانم کە دەبوایە لەم مەسەلەیەدا بەشدار بووماینەو، بەبێ ئێمە ئەو کـارە ئـەنجام نەدرایە، پاشان بەیعەتی کرد بە (ابوبکـر)و موسـڵمانەکانیش خۆشحاڵییان دەربـڕیو پێیـان وت: باشـت کـردو پێکـات.. ئەمانـەو چـەندەها ڕیوایــەتو ڕووداوی تر بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە شورا دەستورێک بووە ئیمامی عــەلیو ئوممەت بەگشـتی پێیـەوە پابـەند بـوونو هـەرگیز باوەڕیـان بـە سیسـتەمی میراتیو ئیمامـەتی یەک لەدوای یەک نەبووە.. ئەگینا چۆن بەشـداری دەکـرد لەو ئەنجومـەنی شورایەی کە خەلیفە عومــەر دیـاری کـردن بـۆ هـەڵبژاردنی خەلیفــەی ســێهەم. ئەگــەر لەلایــەن پێغەمبــەرەوە ﷺ دەقێــک وەیــان فەرموودەیەک هەبوایە بۆ ئــەو مەسـەلە گرنگـە چـۆن ئیمـامی عـەلی لێـی

بێدەنگ دەبوو ؟ وە چۆن پێیەوە پابەند نەدەبوو؟! تەنانەت حەدیسی غەدیر کە باسی لێوە دەکرێ ، زۆربەی زانایانو لێکۆڵەرەوەکانی شیعە خۆیان ڕایان وایە تەنها ڕاسپاردەو ئامۆژگاریەکی شەخصیو خزمانە بووەو بەهیچ شێوەیەک مانایەکی سیاسی تێدا نەبووە.

ئیمامی عەلی ئەوەندە باوەڕو پابەندبوونی بە سیستمی شوراوە بەهێز بووەو بە پلەی یەکەم بە مافی موهاجرینو ئەنصاری داناوە ، بۆیە دوای شەهید بوونی خەلیفەی سێیەم (عوسمانی کوڕی عەفان) کاتێک شۆڕش گێڕەکان داوایان لێ کرد کە دەسەڵات بگرێتە دەست قەبووڵی نەکردو، پێی وتن : ئەوە مافی ئێوە نیە بەڵکو مافی موهاجرینو ئەنصارەو بەهەر کەسێک ڕازی بوون ئەو کەسە دەبێتە ئەمیرو فەرمانڕەوای شەرعی موسڵمانان.

هەروەها بە معاویەی کوڕی ئەبوسوفیانی وت کاتێک لێی یاخی بوو: (اما بعد.. فان بيعتي بالمدينة لزمتك وانت بالشام لأنه بايعني القوم الذين بايعوا ابابكر وعمر وعثمان ، فلم يكن للشاهد ان يختار ولا للغائب ان يرد، وانما الشورى للمهاجرين والأنصار اذا اجتمعوا على رجل فسموه اماما كان ذلك رضا ).

کەواتە لەلای ئیمامی عەلی شورا بنچینەی حوکمو هەڵبژاردنی خەلیفە بووەو لە هیچ شوێنێکدا ئاماژەی بۆ مەسەلەی دەورو دیاری کردنی خەلیفە نەکردوە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ.

ئەم ڕاستیە جارێکی تر زۆر بە ڕوونی لە مەسەلەی چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئیمامی حەسەن ئاشکرا دەبێت، دوای ئەوەی ئیمامی عەلی لێی دراو کەوتە حاڵەتی خەتەرەوە، موسڵمانەکان داوایان لێ کرد حەسەنی کوڕی بکاتە خەلیفە، لە وەڵامدا فەرمووی: نەخێر ! ئێمە لەسەرەمەرگی پێغەمبەردا ﷺ داوامان لێ کرد خەلیفە دیاری بکات، قبوڵی نەکرد.. پاشان داوایان لێ کرد ئاماژە بە کەسێک بکات، بەڵام بۆی نەکردن. بۆیە

وتیان: (ان فقدناك فلا نفقدن ان نبايع الحسن. فقال: لا امركم ولا انهاكم انتم ابصر) الشافي/ج٣/ص٢٩٥

وەنەبێ تەنها ئیمامی عەلی باوەڕی بە شورا بووبێت، بەڵکو موسڵمانان بەگشتیو ئەهلی بەیتی پێغەمبەر ﷺ بەتەواوی بڕوایـان بـە شـورا هـەبووەو داکۆکی‌یان لێ کردووە.. ئەوەتا ئیمامی حەسەنی کوڕی عـەلی دوای ئـەوەی لەبەر بەرژەوەندی گشتیی موسڵمانان وازی لە مافی خۆی هێنا بۆ معاویـەی کوڕی ئەبو سـوفیان بەمـەرجێك دوای خـۆی بگەڕێنـەوە بـۆ شـوراو، کرایـە یـەکێك لـە مەرجـەکانی ڕێکەوتننامـەکـەی نێوانیـان: (... علی انـه لیـس لمعاويه ان يعهد لاحد من بعده ، وان يكون الامر شورى بين المسلمين) شرح نهج البلاغـة (ابـن ابـي الحديـد) ج٤/ص٨، ج١٦/ص٢٢ و (البدايـة والنهايـة)/ج٨/ص١٣ ومروج الذهب /ج٢/ص٤٤..

ئەگەر بهاتبایە خەلافەت لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە ﷺ دیاری بکرایـە وەك (نظرية)ی ئیمامەتی شیعە دەڵێ، ئەوا ئیمـامی حەسـەن بـۆی نـەبوو، واز لـە خەلافـەت بهێنـێ بـۆ معاویـە یـان بـۆ هـەر کەسـێکی تـر بـە هیـچ شێوەیەك، بەڵام بەپێچەوانەوە دوای صوڵح کردن بەیعەتی کرد بـە معاویـەو داوای لـە لایـەنگرانی خـۆی کـرد کـە بەیعـەتی پـێ بـدەن.. ئەمـەش ئـەوە دەگەیەنێ کە باوەڕی بـە شـورا هـەبووەو پێـی وابـووە کـە ئوممـەت مـافی هەڵبژاردنی خەلیفەیان هەیە.

ئیمامی حەسەنیش پابەند بوو بە بەیعەتی معاویەوە تا دوارۆژی ژیانیو، کاتێك هەندێ شیعەی کوفە دوای مردنی ئیمامی حەسەن داوایان لێ کـرد شۆڕش لە دژی معاویـە بـەرپا بکـات، قبوڵـی نـەکردو پێـی ڕاگـەیاندن کـە عـەهدو پـەیمانێك لـەنێوان ئـەوانو معاویـەدا هەیـەو بـۆی نییـە هـەڵی وەشێنێتەوە. بەڵام دوای مردنی معاویەو دیـاری کردنـی یـەزیدی کـوڕی لـە جێگەی کە پێچەوانـەی ڕێکـەوتن نامەکـەی نێوانیـان بـوو، ئەوسـا ئیمـامی حسین ڕەفزی کردو، بڕیاری دا دژی ڕاوەستێتو بەرەو عیراق کەوتـە ڕێو لـە

کەربەلا شەهیدکرا لە ساڵی (٦١)هـ لە ڕووداوێکی دڵتەزێندا. (المفید/ الارشاد ص١٩٩)

کەواتە پێشەوایانی ئەهلی بەیت باوەڕیان بەوە هەبووە کە ئومەت مافی هەڵبژاردنی خەلیفەو پێشەوای خۆیان هەیە لەڕێگای شوراو دژی دەست بەسەراگرتنی دەسەڵات بوون بە زەبری هێز.

فەرموودەیەکیش هەیە کە زۆربەی سەرچاوەکانی شیعە دەیگێڕنەوە لە ئیمامەکانی ئەهلی بەیتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (من جاءکم یرید ان یفرق امر الجماعة ویغصب الامة امرها ویتولی من غیر مشورة، فاقتلوه فان ا لله عز وجل قد اذن ذلك) عیون اخبار الرضی والشیخ الصدوق /ج٢/ص٦١.

ئەم فەرموودەیە چاکترین بەڵگەیە لەسەر ئیمانی ئەهلی بەیت بە شوراو پابەندبوونیان بەم ڕێبازەوە.. وە ئەگەر لە دواییدا داوای خەلافەتیان کردبێ و بانگەشەیان بۆ کردبێ ئەوە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە لەبەرامبەری ئەمەوییەکانەوە خۆیان بە پێشترو چاکتر دەزانی. ئەمەش ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ کە نەزەریەی دەقو دیاری کردنی ئیمامەکان لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە ، هیچ ڕەصیدێکی نەبووە لای جیلی یەکەمی شیعە.. هەر لەبەر ئەوەش بووە کە تێڕوانینیان بۆ (ابو بکر)و (عمر) خوایان لێ ڕازی بێت ئیجابی بووەو بە زۆردارو زاڵمیان دانەناون.

## خەلافەت لە شوراوە بۆ حوکمی بنەماڵە

مێژوو نووسەکانی شیعە سەرەتای سەرهەڵدانی یەکەم گۆڕان لە فیکری سیاسی شیعەدا بەوە تۆمار دەکەن ، کە مەسەلەی حەدیسی غەدیر جۆرێک بووە لە وەسیەتو ڕاسپاردەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمامی عەلی کە ببێتە خەلیفەو جێنشینی خۆی، ئەو کەسەش کە بۆ یەکەم جار بانگەشەی بۆ کرد (عبدا لله کوڕی سەبەء) بوو، کاتی خۆی جولەکە بووەو پاشان موسڵمان بووە. بەڵام ئەم قسەیە هەر بە لاوازیو سنووورداری مایەوە لەناو بەشێکی

کەم لە شیعەداو ئیمامی عەلی لەسەردەمی خۆیدا دژی ڕاوەستاوە، لەو کەسانەش تووڕە بووە کەباسیان لێوە کردووە.

بەڵام دوای ئەوەی معاویە یەزیدی کوڕی کردە جێنشینیو خەلافەت گوێزرایەوە بۆ بنەماڵەی (ابو سفیان) شیعەکان ئەم ڕووداوەیان قۆستەوەو بەهەلیان زانی کە لەکاردانەوەی ئەو گۆڕانکارییە نادروستەدا، بانگەشە بکەن بۆ ئەهلی بەیتی پێغەمبەر ﷺ.. بەڵام کۆسپی سەرەکی لە ڕێگایاندا ئەوە بوو کە حەسەنو حوسەین(ڕەزای خوایان لێبێت) پشتگیر نەبوونو عەلی کوڕی حوسەین گۆشەگیریی کرد لە سیاسەت و، ئەمە وای لێ کردن کە لە دەوری (محمدی کوڕی حەنەفیە) کۆ ببنەوە، بەتایبەتی دوای مردنی حەسەنو شەهید بوونی حوسەین. سەبەئیەکانیش ئەم وەزعەیان بە هەل زانیو بزووتنەوەیەک دروست بوو بەناوی (بزووتنەوەی کەیسانی) کە داوای خوێنی ئیمامی حوسەینیان دەکردو باوەڕیان وابوو کە خەلافەتو ئیمامەت ئەبێ لە محمدی کوڕی حەنەفیەو نەوەکانیاندا بێتو گوایە ئیمامی عەلی وەسیەتی پێ کردوە.

بەهەر حاڵ مەسەلەکە لەوەی کە پێغەمبەرﷺ وەسیەتێکی ئاساییو شەخسی بۆ ئیمامی عەلی کردوە، گۆڕا بۆ وەسیەتێکی سیاسی لەلایەن ئیمامی عەلییەوە بۆ محمدی کوڕی، دوای ئەویش بۆ عبدالله (ابو هاشم)ی کوڕی محمدی حەنەفیە کە لە ژنێکی تری ئیمامی عەلییە جگە لە فاطمەی کچی پێغەمبەرﷺ . ئەوەش بووبە هۆی جیاوازیو پەرتەوازە بوون لەنێوان شیعەکان خۆیانداو، هەر بەشێک بانگەشەی دەکرد بۆ یەکێک لە نەوەکانی ئەهلی بەیتو، شەرعیەتیان لەو نەوەیەدا دەبینییەوە.

بۆ نموونە محمدی کوڕی عەلی کە مەشهورە بە (الباقر) دوای کۆچی باوکی (السجار) لەساڵی (٩٤)ی کۆچی هاتە ناو کێشەکەوەو هەوڵی دا پێشوایەتی شیعە لە (ابو هاشام)ی ئامۆزای وەربگرێتەوە بۆ بنەماڵەی فاطمەو نەوەی حوسەین بەتایبەتیو، خۆی لەهەموان لەپێشتر دەزانی بۆ سەرکردایەتی شیعەو وەرگرتنی خوێنی حوسەینو ئەم ئایەتە قورئانیانەی بە

بەڵگە دەهێنایەوە: ﴿ومن قتل مظلوما فقد جعلنا لوليه سلطانا..﴾، ﴿النبي اولى بالمؤمنين من انفسهم وازواجه امهاتهم، واولوا الارحام بعضهم اولى ببعض في كتاب الله..﴾.

پێی وابوو کە ئەم ئایەتە باس لە ئیمارەت دەکاتو بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ لە هەموو لایەک لەپێشترنو مافی کوڕانی جەعفەرو عەبباسو تەنانەت حەسەنو محمدی کوڕی عەلی تێدا نیە، بەڵکو تایبەتە بە بنەماڵەی حوسەین و، بۆ یەکلا کردنەوەی کێشەکە بەلای خۆیدا پشت ئەستوور بوو بەوەی کە گوایە شمشێرەکەی پێغەمبەری ﷺ لایەو لەباب و باپیرانیەوە بۆی ماوەتەوەو دەیوت: (ان السلاح فينا كمثل التابوت في بني اسرائيل، كان حيثما دار فثم الملك، وحيثما دار السلاح فثم العلم).

## کەواتە نظریەی ئیمامی باقر بەند بووە لەسەر:

عیلمو سیلاحی پێغەمبەرو ﷺ مافی تۆڵە سەندنەوەی ئەو زوڵمەی لە حوسەین کراوە نەک لەسەر دەقو وەسیەتێکی ڕۆشن.. چونکە تا ئەو سەردەمەش واتە لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا هێشتا نظریەی ئیمامەت لەلای شیعە گەڵاڵە نەبوو بوو. جیاوازییەکی ئەوتۆیان نەدەبینی لەنێوان ئیمامی باقرو کەسایەتیەکانی تری بنەماڵەکانی کوڕەکانی ئیمامی عەلیدا. چونکە هەموویان پێشبڕکێیان دەکرد بۆ گرتنە دەستی پێشەوایەتی کردنی شیعە. خاڵی هاوبەشی نێوان گشت بزووتنەوە شیعیەکان بریتی بوو لە شۆڕش کردن دژ بە دەسەڵاتی ئەمەویەکان و، هەر کەسایەتییەکی ئەهلی بەیت هەڵسایە بە شۆڕش، شیعەکان پشتگیرییان لێ دەکرد.

## نظریەی ئیمامەتی ئیلاهی (نظرية الامامة الالهية)

وەک زانیمان کە ئەمەویەکان سیستمی شورای ئیسلامییان گۆڕی بۆ سیستمی میراتیو بنەماڵەیی، ئەوەش کاردانەوەیەکی دروست کرد لای شیعەکان کە بەرهەڵستی سەرەکی دەسەڵاتی ئەمەویەکان بوون، لەسەرەتاوە وتیان ئەهلی بەیتی پێغەمبەر ﷺ لەپێشترن بۆ گرتنە دەستی خەلافەتو

دەسەڵاتی سیاسی. پاشان هەندێک وتیان لەلایەن خواوە دیاری کراون، دواتر هەندێکی تر وتیان ئیمامو پێشەوا دەبێ معصومو پارێزراو بێت لەلایەن خواوە، ئەوەش تەنها بۆ بنەماڵەی پێغەمبەرە ﷺ. ئەم بۆچوونو بیرۆکانە لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیدا گەڵاڵە بوون و، (نظریە)یەکی لێ هاتە کایەوەپێی دەوترێ (نظریة الامامة الالهیة) کە لەسەر بنەماکانی دەقو پارێزراویو دیاری کردن (النص والعصمة والتعیین) لەلایەن خواوە بنیات نراوە.

ئەم نظریەیە دەڵێت کە ئیمامەتو پێشەوایەتی سیاسی موسڵمانان کارێکی خواییەو دیاری کردنی ئیمامی نوێ لەلایەن خواوە دەست نیشان دەکرێو ئیمامی پێشتر هیچ دەستێکی تێدا نیە.

فەلسەفەی عصمەت لەوەوە هاتووە کە خوا دەفەرموێت: ﴿یا أیها الذین آمنوا أطیعوا الله وأطیعوا الرسول وأولي الامر منكم..﴾. وتیان ئیمام هەرکەسێک بێت پێویستە لەلایەن خواوە مەعصومو پارێزراو بێت بۆ ئەوەی فەرمان بە مەعصیەت نەکاتو موسڵمانان نەکەونە سەرلێشێوان لەنێوان بەگوێ کردنی ئیمامو یاخی بوون لەخوا یان لەنێوان بەگوێ نەکردنی ئیمامو یاخی بوون لەخوا لەم سەرەوە کە فەرمان بە گوێڕایەڵی ئیمام دەکات. چونکە باوەڕیان بە ملکەچ بوونی موتڵەق هەبوو بۆ ئیمام نەک بەشێوەیەکی نیسبی.

دوای جێگیر بوونی ئەم بۆچوونە لەلایان، هاتنە سەر ئەوەی کە ڕێگایەک نیە بۆ ناسینو دیاری کردنی کەسی مەعصوم جگە لە ڕێنماییو دیاری کردن لەلایەن خواوە.. بەم هۆیەوە فیکری سیاسی لایەنگرانی ئەم نظریەیە مەبدەئی شورایان پشت گوێ خست بۆ دیاری کردنی پێشەوای موسڵمانان، لەبری ئەوە دەق یان ڕاسپاردەو کارو کرداری موعجیزە ئامێزیان کردە سیفەتی جیاکەرەوەی ئەو کەسەی کە خوا دیاری کردوە بۆ ئەوەی ببێتە ئیمام.

بەم شێوەیە بیردۆزی ئیمامەتی خوایی (نظرية الامامة الالهية) هاتە کایەوەو باوەڕیان وابوو کە ئیمامەت دەبێ لە ئەهلی بەیتی پێغەمبەر ﷺ بێت و، لە ئیمامی عەلیو حەسەنو حوسەینی کوڕیەوە دەست پێ دەکاتو پاشان بەشێوەیەکی ستوونی یەک لەدوای یەک لە نەوەکانی حوسەیندا بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی قیامەت و، سوودیان لەم ئایەتە قورئانیەی خوارەوە وەرگرت بۆ ئەو مەبەستە: ﴿إنما يريد الله ليذهب عنكم الرجس أهل البيت ويطهركم تطهيرا..﴾الاحزاب/٣٣.

بێگومان هاوسەرەکانی پێغەمبەریان لێ دەرکردو، تایبەتیان کرد بە ئیمامی عەلیو فاطمەو حەسەنو حوسەینو پاشان لە نەوەکانی حوسەیندا بەشێوەیەکی ستوونیو، پێیان وابوو کە بەگوێ کردنو فەرمانبەرداریان لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە واجب کراوە. لە پێناو جێگیر کردنی ئەم نظریەیەدا بە چەند قۆناغێکی یەک لەدوای یەک چەند بنەمایەکیان بۆ دارشت، لەوانە:

١- دەق لەجیاتی ڕاسپاردە : لەسەرەتاوە پشت ئەستوور بوون بە ڕاسپاردەی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمامی عەلی، بەڵام لەبەر ئەوەی هیچ مانایەکی سیاسی تێدا نیەو، تەنها باس لە ئیمامی (عەلی)ش دەکات (ئەگەر ڕاست بێت لە بنەڕەتدا)، هەروەها لەبەر لاوازی ئەو ڕاسپاردانەی کە لە ئیمامی عەلیو حەسەنو حوسەینو ئەوانی ترەوە دەیانگێڕانەوە، ناچار بوون زیاتر پشت بە ئایەتە قورئانیەکان ببەستن و، بەشێوەیەکی باطنی دوور لە ڕێزمانو یاساکانی زمانەوە تەفسیرو مانایان لێ دەربهێنن بۆ چەواشە کردنی لایەنگرانیان.

٢- عەقڵ لەبری دەق: لەبەر لاوازی دەقەکانو دەلالەتیان پاشان ناچار بوونی زیاتر پشت ببەستن بە هەندێ ڕاو بۆچوونو لێکدانەوەی عەقڵیەوە بۆ سەلماندنی نظریەکانیان. هەر ئەم هۆیەش پاڵی بە شیعەوە ناوە کە زیاتر ڕوو بکەنە فەلسەفەو بەڵگە هێناوەی عەقڵی . چونکە قورئانو سوننەت بەشێوەیەکی ڕوونو ئاشکرا پشتگیری بۆچوونو نظریەکانیان ناکەن.

٣- موعجیزه لەجیاتی عەقڵ: لەبەر لاوازی دەلالەتی دەقەکانو نەبوونی ڕاسپاردەی ڕۆشن و، بێ هێزی لێکدانەوە عەقڵیەکانیان ناچار بوون هەندێ هەواڵو چیرۆکی خەیاڵیو ئەفسانەیی هەڵبەستن بۆ هەندێ کردەوەی موعجزە ئامێزو زانینی غەیب لەلایەن ئیمامەکانەوە، بۆ چەواشە کردنی خەڵکیو سەلماندنی مەرجەکانی ئیمامەت تیایاندا.

٤- نهێنی بوونو خۆپارێزی (التقیە): ئەم نظریەیە لەناو خەڵکدا ئاشکرا نەبوو، تەنانەت لای ئەهلی بەیت خۆشیان نەزانراو بوو لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا، لەشاری مەدینە هیچ کەسێک بەر گوێی نەکەوتووە. بەڵکو لەسەرەتای سەدەی دووەمی کۆچیەوە لەشاری کوفە دەستی پێ کرد، بەشێوەیەکی نهێنیو ژێرزەمینی. ئەو کەسانەی کە هەڵسوڕێنەرو بانگەشەکەر بوون بۆ ئەم نظریەیە خۆیان ئاشکرا نەدەکرد، بەڵکو بەشێوەیەکی نهێنی درۆو هەڵبەستراوەکانیان بڵاو دەکردەوە، بەپشت بەستن بە هەندێ ڕیوایەتی دروست کراوو لەرزۆکەوە بەناوی (التقیة)وە. ئەوەش بۆ داپۆشینی پلانو نەخشە تێکدەرەکانیان لەلایەکو لەلایەکی ترەوە بۆ لێکدانەوەی ئەو ناکۆکیو دژایەتیەی دەبینرا لەنێوان لافو گەزافی ئەمانو ژیاننامەو ڕەفتارو گوفتاری پێشەوایانی ئەهلی بەیتدا.

بۆیە پابەند بوون بە مەبدەئی توقیەوە زۆر پێویست بوو لایان، بۆ بەرێ کردنی نظریە هەڵبەستراوەکەیانو، لکاندنی بە ئەهلی بەیتەوەو، چەواشە کردنی خەڵکی بەگشتیو شیعە بەتایبەتی.

## نظریەی ئیمامەت لەبەرامبەر ڕەخنەکاریەکانەوە

ئەم نظریەیە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیەوە ڕووبەڕووی گەلێ ڕەخنە بووەوە کە خستیە بەر تاقیکردنەوەو لاوازی و، ناتەواویی دەرکەوت لە چەند ڕوویەکەوە:

١- فەلسەفەی عصمەت: عصمەت لەسەر بنچینەی گوێڕایەڵ بوونی بێ قەیدو شەرت بۆ فەرمانڕەوایان بنیات نرابوو.. گوایە ئەم ئایەتە قورئانیە

بەڵگەیە لەسەری: ﴿یا أیها الذین آمنوا أطیعوا ا لله وأطیعوا الرسول وأولي الامر منکم..﴾.

بەڵام ئەم ئایەتە مانای موتڵەقو بێقەیدو شەرت ناگەیەنێ لە بەگوێ کردنی فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارانەدا، چونکە عورفو عەقڵو بەڵگەکانی تر لە قورئانو سوننەتو ژیانی پێغەمبەرەوە ﷺ ئەوە دڵنیا دەکەنەوە کە گوێڕایەڵ کردنەکە بەشێوەیەکی نیسبیەو لە چوارچێوەی شەریعەتدایە، چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لاطاعة لمخلوق في معصیة الخالق)، (اولی الامر) گشت ئەو کاربەدەستو سەرکردانەی دەگرتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەژیانی خۆیدا دیاری دەکردنو موسڵمانەکان هەرگیز بە مانای موتڵەقو بێ قەیدو شەرت وەریان نەگرتووە.. کاتێک لە گوێڕایەڵی کردنی پێشەوایانو کاربەدەستاندا ڕەهابوون هەڵگیراو (نیسبیەت) جێگیر بوو، هیچ پێویستییەک بۆ مەرجی عصمەت نامێنێ لە ئیمامداو، موسڵمانان دەتوانن پێشەواو فەرمانڕەوای خۆیان هەڵبژێرن لەسەر ئەساسی عەدالەتی ظاهری تەقواو لێهاتوویی، بۆ ئەوەی کارو باری دینو دنیایان بۆ بەڕێوە بەرێت. وە هەرکاتێک ئەو پێشەوا (ئیمام)ە هەڵەی کرد یان لادانێکی کرد، ئەوا موسڵمانان مافی ئەوەیان هەیە بەگوێی نەکەنو هەوڵ بدەن ڕاستی بکەنەوەو تەنانەت لە مەقامی ئیمامەت لای ببەن.. لەلایەن خواوە نەک هەر ئازادن بەڵکو واجبە لەسەریان کە بەگوێی نەکەنو هەوڵ بدەن ڕاستی بکەنەوە وەگەر نا لای ببەن.

بەڵام فەیلەسوفەکانی شیعە مەفهومی نسبیەتیان لە مانای ئایەتەکە ڕەفز کردو سوور بوون لەسەر مانای ڕەهاییو موتڵەقێتی بێ قەیدو شەرتو لەسەر ئەو مەفهومە (نظریة)کەیان دامەزراند و، چەندەها ڕیوایەتو ڕیسایان لەسەری داڕێژا.

بەڵام گرفتی گەورەیان ئەوە بوو کە زانایانو کەڵەپیاوانی ئەهلی بەیت خوایان لێ ڕازی بێت زۆر ڕاشکاوانە بەرپەرچی ڕاوەستانو بە جەماوەریان ڕادەگەیاند کە ئەوانیش وەک هەموو کەسێکی تر مرۆڤی ئاسایینو دوچاری

هەموو جۆرە دیاردەیەکی بەشەری دەبن و، لە گوناهو هەڵە پارێزراو نین و، داوایان لە موسڵمانان دەکرد ئەگەر هەڵەیەکیان کرد ئاگاداریان بکەنەوەو بۆیان ڕاست بکەنەوە.

کەچی سەیرو سەمەرە لەوەدا ئەوەبوو بانگکەرانی ئیمامەت هەڵوێستی پێشەوایانی ئەهلی بەیتیان بەشێوەیەکی تر لێک ئەدایەوە؛ کە گوایە ئەوە لەبەر (تقیە)و خۆ پاراستنە لە دەسەڵاتدارانو نایانەوێ حەقیقەتی خۆیان هەموو کەس لێی ئاگادار بێت.. بەو شێوەیە جەماوەری شیعەیان چەواشە دەکرد.

**کێشەی (البداء):** لەلایەکی ترەوە(نظریە )ی ئیمامەت دوچاری نسکۆیەکی تر بوونەوە کاتێک (اسماعیل کوڕی جعفر الصادق) کۆچی دوایی کرد، ئەوە بوو ئیمامیەکان لەشاری کوفە لەدەوری خڕ بوونەوەو وایان بڵاو کردبووەوە کە ئیسماعیل جێنشینی باوکیەتیو باوکی دەست نیشانی کردوەو ئاگاداری کردوون. بەڵام کاتێ مرد باوکی هێشتا لەژیاندابوو ، دەرکەوت کە دیاری کردنەکەی لەلایەن خواوە نەبووە، ئەگینا ئەدەبوو پێش باوکی لەدنیا دەربچوایە. بەم هۆیەوە ژمارەیەک لە لایەنگرانی (نظریە )ی ئیمامەت ؛ وەک (سلیمانی کوڕی جەریر)و کۆمەڵێک لەشیعە هەڵگەڕانەوەو وتیان ئیمام جەعفەری صادق تەنها کەسایەتی‌یەکی ئاسایی خاوەن زانستەو ئیمامەتیش مەسەلەیەکی ئاسایی بەشەری‌یەو پەیوەندی بەخواوە نی‌یە.

بەڵام کۆمەڵێکی تریان دانیان بە مردنی ئیسماعیلدا نەناو وتیان نەمردوە، بەڵکو باوکی حەشاری داوە بۆ ئەوەی لە مەترسی دەربازی بکات، بەمەرجێک باوکی بە دەستی خۆی تەرمەکەی دابەزاندە ناو گۆڕەکەیەوە، شیعەکانی بانگ کرد کە سەیری بکەنو لە مردنی دڵنیا ببن، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا کۆمەڵێک لە شیعە بڕوایان بەمردنەکەی نەکردو، سووربوون لەسەر حەشار دانو خۆشاردنەوەی و، فیرقەی (اسماعیلی)یەکانیان دروست کردو پاشان دەوڵەتی (فاطمی )یەیان دامەزراند لە میصرو باکوری ئەفەریقا.

بەڵام ئەوانەیان کە ئیعترافیان بە مردنەکەی کرد، دوچاری گێچەڵێکی تر هاتنو وتیان ڕاستە مردوە، بەڵام هۆکەی ئەوەیە کە خوا گۆڕان لە ئیرادەیدا ڕووی داوە لە بەرامبەر ئیسماعیلەوە.. ماوەیەک بڕوایان وابوو کە (عبدالله الافطح)ی برایەتی لە مەدینەو بەڵام ئەویش مرد، دواتر جێگیر بوون لەسەر ئیمامەتی (موسی الکاظم).

**کێشەی منداڵێتی:** لایەنگرانی ئیمامەت لەبەر ئەوەی بەڵگەو دەقی ڕۆشنیان دەست نەدەکەوت، ناچار چەندەها چیرۆکو سەرگوزەشتەی ئەفسانەییو موعجیزە ئامێزیان دەگێڕایەوە بەناوی ئیمامەکانەوە، گوایە غەیب دەزانن و لەلایەن خواوە فێردەکرێن و پەیوەندییان بەخواوە هەیە، ئەمە هەمووی بۆ چواشەکردنی جەماوەری شیعەی خێرنەدیوو سەلماندنی (نظریە)و بۆچوونەکانیان.

بۆ نموونە کاتێک سەرگەرمی هەڵبەستنی چەندەها چیرۆکو ڕووداوی سەیرو ئەفسانەیی بوون لەپێناو دڵنیا کردنی ئیمامەتی ئیمام ڕەزادا، لەساڵی (٢٠٣)ی کۆچیدا وەفاتی کردو کوڕەکەی (محمد الجواد) لە تەمەنی (٧) ساڵیدا بوو.

ئەمەش کێشەیەکی نوێی بۆ پەیدا کردن، چونکە چۆن دەبێ منداڵێک کە ناتوانێ سەرپەرشتی خۆی بکات چۆن دەتوانێ ئیمامەتو پێشەوایەتی خەڵک بکات، لە کاتێکدا منداڵەکەی لە شاری مەدینە بەجێ هێشتوەو فرسەتی فێرکردنو پەروەردە کردنی نەبووە لەلایەن باوکییەوە.

ئەم کێشەیە بووبە هۆی دابەش بوونی شیعەی ئیمامی بۆ چەند فیرقەیەک.

بەڵام لایەنگرانی ئیمامەت بە ئاسانی بەسەر ئەم کێشەیەدا زاڵ بوون، چونکە بەلای ئەوانەوە ئیمامەت وەک نبوەت وایەو لەخواوەیە، بۆیە زۆر بەئاسانی ئایەتی قورئانیان کردە بەڵگە لەسەر ئیمامەتی (محمد الجواد) ﴿واتیناه الحکم صبیا﴾ هەرچەند هیچ جۆرە دەقو وەسیەتێکی ڕۆشن نەبوو لەلایەن ئیمام ڕەزاوە لەسەر ئیمامەتی جەوادی کوڕی، بگرە تەنانەت ڕۆژێک

لەرۆژان قسەیەکی نەکردبوو کە باس لە ئیمامەتی خۆی بکات، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لایەنگرانی نظریەی ئیمامەتسووربوون لەسەر ئەوەی کە (محمد الجواد) ئیمامە بۆ ئەوەی نظریەکەیان دوچاری هەرەس هێنان وهەڵوەشاندنەوە نەبێت.. لەو پێناوەشدا چەندەها چیرۆکو ئەفسانەی موعجیزە ئامێزیان هەڵبەست کە تیایدا باس لەوە دەکات کە گوایە (محمد الجواد) غەیب دەزانێو لەلایەن خواوە پەیوەندی پێوە دەکرێت، هەرچەند منداڵە..

جارێکی تر کێشەی منداڵێتی دوپات بوویەوە: لەگەڵ (علی الهادی) کوڕی (محمد الجواد)دا چونکە (محمد الجواد) هەر لەتەمەنی لاوێتیدا کۆچی دوایی کردو دوو کوڕی منداڵی لەدوای خۆی بەجێ هێشت (علی و موسی) کە تەمەنیان لە حەوت ساڵان تێ نەدەپەڕی. باوکیان وەسیەتی کردبوو بۆ پیاوێک بەناوی (عبدالله کوڕی مساوەر) بۆ ئەوەی ئاگای لە ماڵو موڵکو ئەرزو ئاوەکەیان بێت، تاکو (علی الاهدی) دەگاتە تەمەنی بلوغ .

لێرەدا شیعە دوچاری کێشەیەک بوونەوە، ئەگەر (علی الهادی) ئەوەندە منداڵ بێت کە نەتوانێ سەرپەرشتی ماڵو موڵکی بنەماڵەکەیان بکات ، ئایا چۆن دەتوانێ ئیمام بێت ؟ وە کێ لەم ماوەیەدا تا گەورە دەبێت هەڵسێت بەکاروباری ئیمامەت ؟

ئەم کێشەیە بووبە هۆی دابەش بوونی شیعەکان بۆ دوو بەش، هەر بەشەو باوەڕی بە ئیمامەتی یەکێک لە دوو کوڕەکەی (محمد الجواد) هەبوو و، لەو بوارەدا کۆمەڵێک چیرۆکو ئەفسانەیان دروست کردبوو بۆ چەواشە کردنی شیعە داماوەکان.

جارێکی تر کێشەی (البداء): هەرچۆنێک بوو (علی الهادی) کرایە ئیمام هەر لە ژیانی خۆیدا (محمدی کوڕی) کردە جێگەداری خۆی ، بەڵام هەر لە ژیانی باوکیدا مردو ناچار وەسیەتی کرد بۆ براکەی (الحسن العسکری (٢٣٢هـ -٢٦٠هـ)، هەروەک چۆن سەد ساڵ پێش ئەم ڕووداوە لەکاتی

مردنی ئیسماعیل کوڕی ئیمام جەعفەردا کێشەیەک دروست بوو، ئەمجارەش هەمان کێشە دوپات بوویەوە، چونکە بەشێک لە شوێنکەوتوانی (علی الهادی) دانیان بە مردنی محمدی کوڕیدا نەناو وتیان نەخێر ئیمام نامرێو بەوە لێکیان دایەوە کە گوایە باوکی شاردویەتیەوە لە ترسانو بۆ ئەوەی لە چاو و ڕاو دووری بخاتەوەو لەسەر ئەساسی (تـوقیـە) ئـەو کـارەی کردوە.. دوای مردنـی عـەلی الهـادی کێشـەو گرفتێکـی تونـدو تیـژ ڕوویـدا لەنێوان (جعفری کوڕی علی الهادی)و (حسن)ی برایدا.

هەمان کێشە جارێکی تر لەکاتی مردنـی (الحسـن العسـکری)دا تـازە بوویەوە، چونکە (حسن) مرد بەبێ ئەوەی هیچ کوڕێکی لێ بـەجێ بمێنـێو وەسیەتێک بۆ کەسێک بکات.. ئەمە بوو بە هۆی دروست بوونی گـەورەترین کێشەو ناهەموارترین سەرگەردانی لە مێژووی شیعەی ئیمامیداو زیـاتر لـە (١٤) فیرقەیان لێ کەوتەوە، هەر یەکەو ڕاو بۆچوونی جیاوازی هەبوو.

هەندێکیان وتیان جارێکی تـر دەگەڕێتـەوە بـۆ ژیـانو، بەشـێکی تریـان وتیان دەبێ کوڕێکی نهێنی لەدوا جێمابێو ئەوە (المهدی المنتظر)ە.

## بەشی دووەم

# گۆرانکاری گەورە لە (نظریە)ی ئیمامەتـدا

### سەرهەڵدانی (نظریە)ی دوانزە ئیمام

ئەگەر بە وردی سـەیری مێـژووی شـیعە بکـەین لـە سـەدەکانی دووەم سێیەمی کۆچیدا ، دەبینین کە شیعەکان لەگەڵ گشت شۆڕشـێکدا بـوون کـە پیاوانی سەر بە ئەهلی بەیت پێی هەسـتابن.. وەک شۆڕشـی (زەیـدی کـوڕی عەلی) کوڕەکانی (یحی)و (عیسـی)، هـەروەها شۆڕشی (محمـدی کـوڕی عبدا لله) کە نازناوە بە (ذي النفس الذكية)و (ابراهیـم)ی بـرای کـە لـە نەوەی (ئیمام حسن)ن، پاشان شۆڕشی (حسین)و دواتـر شۆڕشـی (محمـدی کوڕی قاسم)و کەسانی تر.

شیعە بەگشتیو بەبێ جیاوازی لە دەوری ئەو پێشەوایانە کۆدەبوونـەوە، بەبێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی کە لـە چ زنجیرەیەکـەو ئایـا دەقو وەسـیەت لەبارەیەوە هەیە یان نا ؟ لەلایەن خواوەیە وەیان لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ .

هـەروەها بـەبێ ئـەوەی کەسـێک بـاس لـەوە بکـات کـە ئیمامـەت بەشێوەیەکی ستوونی دەبێت لە نەوەکانی (حسـین) تـا ڕۆژی قیامـەت، بـە واتایەکی تر شـیعەی ئـەو زەمانـە بەشـێوەیەکی گشـتی زۆر دوور بـوون لـە (نظریە )ی ئیمامـەت کـە هـەندێ لـە فەیلەسوفەکانی شـیعە بەشـێوەیەکی نهێنی قسەیان لەبارەوە دەکردو چەندەها ڕیوایەتو چیرۆکیان بۆ پێشەوایانی ئەهلی بەیت دروست دەکردو ئەوانیش بەصەراحەت بەدرۆیان دەخستەوە.

ئەگەر سەرنجی کەلەپوور نوسراوەکانی شیعەی ئیمامی بدەین لـەو دوو سـەدەیەدا (سـەدەی دووەمو سـێیەمی کۆچی)، بۆمـان دەردەکـەوێت کـە (نظریـە )ی ئیمامـەت کـراوە بـووە تـا ڕۆژی قیامـەتو لـە ژمارەیـەکی دیاریکراودا نەبووەو بۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو نـەبووە.. هەرچـەندە لـەکاتی مردنـی (الحسـن العسـكري)دا گەیشـتە بـن بەسـت لـە سـاڵی (٢٦٠)ی کۆچیدا، بەبێ ئەوەی لەدوای خۆی کوڕێک بـەجێ بهێڵێ یـان وەسـیەت بـۆ

کەسێک بکات . هەرچەند هەندێ لە شیعە باوەڕیان وابوو کەوا کوڕێکی شاراوەی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووەو ئیمامەت لە ئەوەی ئەو کوڕە شاراوەدا بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی قیامەت و، لەسەرەتاوە بڕوایان وانەبوو کە ئەو کوڕە شاراوەیە دوا ئیمامەو ژمارەیان دوانزە ئیمام زیاتر نابێ .

هەر لەبەر ئەوەی کە (نظریه)ی ئیمامەت لە سەرەتاوە کراوەبووە تا ڕۆژی قیامەتو ژمارەیان دیاریکراو نەبوو، بۆیە (نظریه)کە باسی لەوە دەکرد کە دەقو وەسیەت دەربارەی ئیمام عەلی کوڕی ئەبو تالیب هەیەو پاشان هەر ئیمامێک پێش مردنی ئیمامی دوای دوای خۆی دیاری دەکاتو بەم شێوەیە دەبێ تا ڕۆژی قیامەت.. تەنانەت زۆر جار (دەق)یان دەست نەدەکەوت لەلایەن ئیمامێکەوە بۆ ئیمامی دوای خۆی، بۆیە ناچار پەنایان دەبردە بەر وەسیەتێکی ئاساییو ئەیانکردە بەڵگەو، کاتێک وەسیەتیشیان دەست نەدەکەوت پەنایان دەبردە بەر شمشێرەکەی پێغەمبەر ﷺ یان هەندێ چیرۆکی ئەفسانەیی هەڵبەستراو.

## لەدایك بوونی (نظریه)ی دوانزە ئیمام

کاتێک (نظریه)ی ئیمامەت گەیشتە ڕێگایەکی بن بەست دوای مردنی (الحسن العسکری) بەبێ ئەوەی کوڕێکی ئاشکراو ناسراو بەجێ بهێڵێ دواتر باوەڕیان هاتە سەر ئەوەی کە کوڕێکی شاراوەی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووەو تا ماوەیەکی درێژ دەرنەکەوت، بۆیە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا (نظریه)ی ئیمامەت گۆڕانێکی گەورەی بەسەردا هاتو (نظریه)ی دوانزە ئیمامی لێ پەیدا بوو؛ کە دەڵێت: لیستێکی پێشینە هەیەو ناوی هەر دوانزە ئیمامەکەی تێدا دیاری کراوە لەلایەن پێغەمبەری مەزنەوە ﷺ کە ئەمانە ناوەکانیانە: بەڕێز (علی، حسن، حسن ، علی کوڕی حسین، محمدی کوڕی علی، جعفری کوڕی محمد، موسی کوڕی جعفر، علی کوڕی موسی، محمدی کوڕی علی، علی کوڕی محمد، حسن کوڕی علیو دوانزەهەمین ئیمامی غائب محمد کوڕی الحسن العسکری)یە. هەر ئیمامێک کە لەنەوەی ئیمامی حسین نەبێ دانیان پێدا نەناو ڕەتزیان کردو ئەم لیستەیان

تەنها لە نەوەكانی ئیمامی حسین رێكخستو بەشێوەیەكی عەمرودیو بۆ سەلماندنی ئەم (نظریە)یە دەیان حەدیسیان هەڵبەست بەناوی پێغەمبەر ﷺو ئیمامە پێشینەكانی ئەهلی بەیتەوە.

هەروەها هەوڵیاندا كە سوود وەرگرن لە چەند حەدیسێك كە لە كتێبەكانی ئەهلی سوننەت دایە دەربارەی (المهدی المنتظر)و ئەهلی بەیت. (نظریە)ی دوانزە ئیمامی مێژووی شیعەو مێژووی ئیمامیەكانی پشت گوێ خستو كێشەی دەقو وەسیەتو چۆنیەتی ناسینی ئیمامی تازەی لەلایەن شیعەوە لەبیری خۆی بردەوەو درێژ بوونەوەی عەمرودی لە بنەماڵەی حسیندا كردە مەرج، با ئەو كەسەی كە قەرارە ئیمام بێت منداڵێكی بچكۆلەش بێت.. بەم شێوەیە (نظریە)ی شیعەی دوانزە ئیمامی هاتە كایەوە كە دەڵێ ئیمامی دوانزەهەم غایبەو دەبێ شیعە چاوەڕوانی دەركەوتنی بكەن.

بەم هۆیەوە شیعەی دوانزە ئیمامی لە شانۆی ژیانی سیاسەت كشانەوەو ڕێگا چۆڵ بوو بۆ فیرقە شیعەكانی تر وەك اسماعیلیەو زەیدیە بۆ ئەوەی لەگۆڕەپانی سیاسەتدا ڕۆڵی خۆیان ببینن.

## دانراوە (فرضیة)ی مەهدی منتظر

## (محمد كوڕی حەسەنی عەسكەری)

**مردنی حەسەنی عەسكەری:** مردنی حەسەنی عەسكەری لە سامەڕا لە ساڵی (٢٦٠)كۆچیدا بەبێ ئەوەی كەسێك لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێ، بوویەهۆی سەرهەڵدانی كێشەیەكی ترسناكو ناهەموار لە ڕیزی شیعەی ئیمامیدا، ئەوانەی كە باوەڕیان وابوو ئیمامەت لەلایەن خواوە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێتو بەشێوەیەكی عەمرودیش لە نەوەكانی حەزرەتی حسیندا. ئەمەش بوو بە هۆی ڕوودانی جۆرێك لە گومانو ئاڵۆزیو سەرگەردانیو دوودڵی بەرامبەر چارەنووسی ئیمامەت لە دوای حەسەنی عەسكەری لەبەر جیاوازی هەڵوێستیان بەرامبەر ئەو كێشەیە(١٤) كۆمەڵیان لێ پەیدا بوو.

مێژو نووسەکانی شیعە دەڵێن : (جاریە)یەکی ئیمام حەسەنی عەسکەری باسی ئەوەی کردوە کە گوایە سکی هەیە لە ئیمام. بەو بۆنەیەوە دابەش کردنی میراتەکەی دواخراو خەلیفەی عەبباسی (المعتمد با لله) کە لەو سەردەمەدا لە سامەڕا دادەنیشت ، فەرمانی دا بە هاوسەرەکانی کە ناگاداری ئەو جاریەیە بکەن تا دڵنیا دەبن لەسەرەنجامی سکەکەی، لەئەنجامدا دەرکەوت کە ڕاست نیەو، پاشان میراتەکەیان بەش کرد لەنێوان دایکیو جەعفەری برایدا.

دوای ئەوە جەعفەری برای هەوڵی دا سود وەربگرێ لەو بۆشاییەی کە براکەی کوڕی لەدوا بەجێ نەماوەو وەسیەتیشی بۆ کەس نەکردوە، بۆیە ڕایگەیاند کە خۆی ئیمامەو، بە شیعەکانی وت: ئەوەتا براکەم ڕۆیشتو کەسی لەدوای خۆی لێ جێ نەماوە؛ نەکوڕو نە کچ، بۆیە من ئیمامم.

• بەڵام هەندێ لە شیعەی ئیمامی ڕایان گەیشتە ئەوەی کە ئیمامەت ڕاوەستاوەو کۆتایی پێ هاتووەو، سەردەمی (فەترە) وەک فەترەی نێوان پێغەمبەران.

• لەلایەکی ترەوە بەشێک لە شیعەکان پەشیمان بوونەوە لە باوەڕ بە ئیمامەتی حەسەنی عەسکەری خۆیو باوەڕیان هاتە سەر ئەوەی کە حەسەن خۆی هەر لە بنەڕەتدا ئیمام نەبووەو بەهەڵە کراوە بە ئیمام، چونکە ئیمامی ڕاستەقینە نابێ بمرێ پێش ئەوەی کوڕێکی خۆی لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێو وەسیەتی ئیمامەتی بۆ بکات.

• بەشێکی تریان وتیان ئەبوایە هەر لە سەرەتاوە جەعفەری برای حەسەن ئیمام بوایە.

• بەشێکی تریان ئینکاری مردنی حەسەنیان کردو وتیان ئەوە مەهدیەو ماوەیەک ون دەبێتو پاشان دەگەڕێتەوە، چونکە پێیان وابوو ئیمام نابێت بمرێت پێش ئەوەی کوڕێک لەدوای خۆی بەجێ بهێڵێت بۆ ئەوەی ببێتە ئیمام، گوایە زەوی نابێت خاڵی بێت لەئیمام ڕۆژێک لەڕۆژان،

بۆ ئەو مەبەستە پێیان وابوو مردنی حەسەن جۆرێکە لەخۆحەشاردانو غائب بوون.

• بەشێکی تر پێیان وابوو کە ڕاستە مردوە، بەڵام زیندوو دەبێتەوەو جارێکی تر دەگەڕێتەوە بۆ ژیان بۆ تەواو کردنی ئەرکی ئیمامەتەکەی.

• هەندێکی تریان وتیان لە ئایندەدا دەگەڕێتەوە بۆ ژیانو ناویان نا (القائم)، واتە دوای مردنی جارێکی تر هەڵدەستێتەوەو زەوی پڕ دەکات لە عەدالەت دوای ئەوەی پڕکراوە لە ستەمو نارەزایی.

بۆ هەریەکێ لەو هەڵوێستو بۆچوونانە چەندەها حەدیسو ڕیوایەتیان دروست کرد بۆپشتگیری کردن لە بۆچوونەکانیان.

• بۆ دەرچوون لەم کێشە ناهەموارە، هەندێ لە شیعەی ئیمامی کە باوەڕیان وابو ئیمامەت بەشێوەیەکی عەمودی بەردەوامە تا ڕۆژی قیامەت، ڕایان هاتە سەر ئەوەی کە دەگونجێ ئیمام حەسەنی عەسکەری کوڕێکی بەجێهێشتبێو لەبەر هەر هۆیەکێ بێت شاردبێتیەوە.

لە گەرمەی کەشو هەوای گومانو جیاوازیو بۆچوونو گەڕان بەدوای ڕاستیدا، هەندێ لە شیعەکان گەڕانەوە بۆ قسەی (جاریە)کە کە ئیدیعای کردبوو گوایە سکی هەیە لە ئیمام پێش مردنی و، وتیان بێگومان دوای خۆی کوڕەکەی لەدایکێ بووە بە هەشت مانگو ئێستا شاراوەیەو ناوو شوێنی زانراو نیە.

هەیان بوو باوەڕیان وابوو کە منداڵەکە لە سکی دایکیدا بەشێوەیەکی موعجزە ئامێز بۆ ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە.. تا لەم کاتەدا ژمارەیەکێ لە هاوەڵەکانی حەسەنی عەسکەری دەیان چپاند بەگوێی هەندێ کەسدا کە گوایە ئیمام پێش مردنی کوڕێکی بەجێهێشتوەو شاراوەیەو پێویستە کەس بە ئاشکرا ناوی نەبات.. ئەم جەماعەتە ناسران بە فیرقەی (الاثنی عشرية) واتە دوانزە ئیمام.

ئەم سەرگەردانیو سەرلێشێوانە تا ناوەڕاستی سەدەی چوارەمی کۆچی درێژ بوویەوە.. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بوونی (کوڕی حەسەنی

عەسکەری) مەسەلەیەکێ نەبووە کە ئیجماعی لەسەر بوویێت لەنێوان شیعەی ئیمامی ئەو سەردەمەدا.

ئەوەی کە لەم دواییەداو تا ئێستاش ئیددیعای لەسەر دەکرێت گوایە ئیجماع و تەواتوری حەدیس بەڵگەیە لەسەر لەدایکێ بوونی ئیمامی دوانزەهەم بەناوی (محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەری) ئەصڵ و ئەساسی نیەو، لەو سەردەمەدا وجودی نەبووە.

## توێژینەوەی نظریەی ئیمامی دوانزەهەم

ئەم نظریەیە پێکێ دێت لە دوو بەش:

باوەڕ بە بوونی ئیمامی دوانزەهەم (محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەری)و هەر ئەویش (مەهدی منتظر)ە.

بەڵام توێژینەوەی قووڵی مێژوویی سەبارەت بە چیرۆکی پەیدابوونی ئەم (نظریە)یە ئەو ڕاستیەیە ئاشکرا دەکات کە ماوەیەکی (بۆشاییەکی) زەمەنی دوورو درێژ لەنێوان هەردوو بەشی (نظریە)کەدا هەیە، چونکە لەسەرەتاوە تەنها باس لەبوونی کوڕی ئیمام حەسەنی عەسکەری دەکرا کە لە ئیمامەتدا جێگای باوکی دەگرێتەوە.

پاشان گۆڕانی بەسەرهاتو قسە لەوە کرا کە ئەو کوڕە گومان کراوە مەهدی (منتظر)ە ئێستا (غائب)ە.. غائب بوونەکەیان کردە بەڵگەی ئەوەی کە باوکی ئاشکرای نەکردوەو دوای باوکی، خۆی دەرناخات. مێژووی پێشەوایانی ئەهلی بەیتو ئەو ڕیوایەتانەی کە کەلەپووری شیعەی ئیمامی پاراستوونیو تا ئەمڕۆش ماونەتەوە ئەوە دڵنیا دەکەن کە مەسەلەی پێناسی (هویە) مەهدی ڕۆشن نیەو ناوو زەمانی دەرچوونی دیاری نەکراوە، نە لەبەر ترس بەڵکو لەبەر ئەوەی کە لەوەو بەر دیاری نەکراوە، چونکە بیرۆکەی (مەهدی) تەنها ناوو ئومێدێکێ بووەو هیوایان پێیەوە بەستووە.

ئەگەر بەڕاستی پێناسو ناوی مەهدی هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە ﷺ دیاری کرابایە، شیعە ئیجماعیان لەسەری بوایە، ئەوا سەرگەردان

نەدەبوون و، بەڕاستو چەپدا نەدەڕۆیشتنو چەندەها بۆچوونو ڕای جیاوازیان لەبارەیەوە نەدەبوو.

چونکە بیرۆکەی مەهدی لەڕاستیدا دوای شەهید بوونی حوسەین سەری هەڵدا. ئەوە بوو ئەمەوییەکان تەواو خۆیان مەحکەم کردو شیعەکان خۆیان دەخواردەوە بۆ تۆڵە سەندنەوەو شۆڕش لە دژی حوکمی ئەمەوییەکانو بۆ ئەو مەبەستە لە دەوری هەر پیاوێکی ئەهلی بەیت کۆدەبوونەوەو ناویان دەنا مەهدی، کاتێک ون دەبوو پێش ئەوەی ئاواتیان بێتە دی، دەیان وت ئەوە ون بووەو لە ئایندەدا دەر دەکەوێت.

هەر بەم ئومێدەوە لە دەوری ئیمام جەعفەری صادق خڕ بوونەوەو وایان دەزانی کە مەهدی خۆیەتی.. بەڵام کاتێک کۆچی دوایی کردو ئاواتی شیعە نەهاتە دی، هەندێکیان ئینکاری مردنیان کردو سووربوون لەسەر ئەوەی کە خۆی ون کردوەو بەم نزیکانە دەگەڕێتەوە چونکە (مهدی المنتظر)ەو شۆڕش دەکات لە دژی دەسەڵاتی ئەمەویەکانو عەدالەت بەرپا دەکات دوای ئەوەی زوڵمو ستەمیان دنیا پڕکردووە..

لەکاتی توند بوونی فشاری سیاسی عەبباسییەکان لەسەر شیعە، لە دەوری ئیمام موسای کاظم کۆبوونەوەو باوەڕیان وابوو کە (مەهدی)یە، چەندەها ڕیوایەتو چیرۆکی سەیرو سەمەرەیان لە بارەیەوە دروست کرد کە هەمووی زادەی سۆزو ئاواتو موعاناتیان بوو.. بەڵام کاتێک لە تەمەنی (٣٥) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، شیعەکان بەگشتی باوەڕیان بە هەواڵی مردنەکەی نەکردو وتیان خۆی حەشارداوەو (مهدی المنتظر)ەو دێتە دەرەوەو زەوی پڕدەکات لە دادو دوای ئەوەی پڕ کراوە لە زۆرو ستەم.

ئەوەش کە بەڵگەیە لەسەر ئاڵۆزیو ڕۆشن نەبوونی پێناسی مەهدی لای ئەهلی بەیتو جەماوەری شیعە لە سێ سەدەی یەکەمی کۆچیدا، ئەوەیە کە چەندەها جار لێرەو لەوێ بانگەشەی مەهدی دەربات بۆتەوە کە لە دەیان جار زیاترە.

لەمەوە دەردەکەویت کە (نظریە)ی مەهدی ژمارەیەک لە ئیمامەکانی ئەهلی بەیتی گرتۆتەوەلەکاتو شوینی جیاوازداو زیاتر مانای شۆڕشو هەڵسانو دەرچوون لە دژی دەسەڵاتی سیاسی سەردەم بووەو، هەرگیز کەسێکی دیاری کراو نەبووەو مەسەلەی غەیبەتو غائب بوون کاتێک وەدەر دەکەوت کە ئیمامەکە سەرنەکەوتایە یان بمردایە پێش گەیشتن بە ئامانجەکانی، زۆر لەوە دەچێ کە هەندێ مونافقو چاوچنۆک لە هاوڕێکانی ئیمامەکان ئەو ئەفسانە خەیاڵیەی (مەهدی)یان دروست کردبێت بۆ چەواشەکردنی عەوامو وەرگرتنی پارەو شتومەک بەناوی ئەوەی کە وەکالەتیان لە ئیمامەوە پێ دراوە. ئەو زۆرێتیو جیاوازیەی کە لە بزوتنەوەکانی (مەهدی)دا هەیە، بەڵگەیە لەسەر ئاڵۆزی ناڕۆشنی لە بیرۆکەی (مەهدی)داو دەگونجێ هەرکام لە پێشەوایانی ئەهلی بەیت بوربێت. ئەوەتا هەر کۆمەڵێک لە شیعە باوەڕیان وایە کە لە فلانە بنەماڵەیە؛ هاشمی یان عەلەوی یان فاطمی یان حەسەنی یان حوسەینیو یان موسەویو... هەروەها.

لەمەوە ئەوەمان بۆ دەرەنجام دەبێت کە ئەو قسەیەی دەڵێت مەهدی کوڕەکەی حەسەنی عەسکەرییە، ئەو دانراوەیەو (فرضیة)یە کە دوای ئەوە هاتۆتە کایەوە کە بڕیار دراوە کوڕێکی نهێنیو شاراوەی هەبێت بۆ لێکدانەوەی غائب بوونو ئیعلان نەکردنی لەلایەن باوکیەوە گوایە غائب بوون یەکێکە لە سیفەتەکانی مەهدی.

زانایانی شیعەی ئیمامی لەسەرەتاوە واتە دوای مردنی حەسەنی عەسکەری لە (٢٦٠)ی کۆچی‌دا هەوڵی ئەوەیان دەدا کە بیسەلمێنن حەسەن کوڕێکی شاراوەی نهێنی هەیەو ئیمامی دوانزەهەمە، بەهیچ جۆرێک لەیان لەوە نەکردووە کە (مهدی منتظر)ە.

بەڵام ئەو کێشەیەی کە لەدوای ئەوە تیۆەی گەلان بریتی بوو لە (دەرنەکەوتنی ئیمام بۆ ئەوەی هەستێ بە ئەرکی ئیمامەت).. ئەم کێشەیە چارەی کردن بگەڕێن لە دووی دەرچەیەکو لەو سەرلێشێوانو کێشەیە دەرباز

بین. لەو پێناوەدا باشترین ڕێگاچارەیان لەو ڕیوایەتانەدا بینیەوە کە باس لە مەهدی دەکەن بۆ خۆ قوتار کردن لـە کێشـەی غـائب بـوونو دەرنەکـەوتنیو کردیانە بەڵگەیەکی نوێ بـۆ سـەلماندنو جێگیرکردنی (فرضیـة)ی بوونـی کوڕێک بۆ حەسەنی عەسکەری.

لێرەوە (فرضیة) دانراوە کە بریتی بوو لە سـەلماندنی بوونـی ئیمـامی دوانزەهەمو بەس، گۆڕا بۆ ئەوەی دەم لەوەش بـدەن کـە ئـەو کـوڕە نهێنیـیـە (مهدی منتظر)ەو ئیتر لەوە بەدواوە باس هەر باسی مەهدیو غائب بوونیو دەرنەکـەوتنی دەکـراو ئـەو دەرەنجامـەیان بەدەسـت هـانی کـە ئـەو کـوڕە نهێنییە ئیمامەو (مهدی)یـە کـە غائبـەو هـۆی دەرنەکـەوتنی ئەوەیـە کـە (غائب)ە.

دوای ئـەوەش مەسـەلەی دوو غەیبـەت بوونەکـەیان هەڵبەسـت واتـە (الغیبة الصغری والغیبة الکبری)و پاشـان مەسـەلەی نیابـەتی تایبـەت کـە ژمارەیەک لە (٢٠) کـەس زیـاتر ئیدیعایـان کـردوە بـەڵام چواریـان لـەناو هەموویاندا خۆیان سەپاندو شیعەکان باوەڕیان پـێ دەکـردنو مـاڵو داراییو زەکاتیان تەسلیم دەکردن گوایە لە نیابەتی ئیمامەوە وەری دەگـرنو دابەشـی دەکەن.

کەواتە (نظریە)ی دوانزە ئیمامی (الاثنی عشـریة) ئـاڵۆزو لاوازو بـێ بنەڕەتەو هیـچ جـۆرە بەڵگەیـەکی ڕاسـتو دروسـتی لەسـەر نیـەو دانـراوەی کوڕێک بـۆ حەسـەنی عەسـکەری تـەنها گومـانو چەواشـە کـردنو تـەخمین کردنەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە.

## ناکۆکی ڕیوایەتەکان

هەرکەسێک ئاگاداری ئـەو کەلـەپوورە زانیاریـیـە مەزنـەی موسـڵمانان بێت لەبواری ڕیوایەتو گرنگی دانی زانایان بەگشتی شـارەزابێت کـە چـەندە بەتەنگ بژارکردنو جیاکردنەوەی ڕاستو ناڕاسـت یـان لاوازو بـەهێزبوون، وە چـەندە بایـەخیان داوە بـەوەی کـە ئـەحکامی شـەرعی لەسـەر بنچینـەی

:انستی‌یانه‌ی پێمو بنیات بنێن‌و هەرگیز بواریان بەخۆیان‌و بەکەس نەداوە کە مەسەلەکانی ئایین لەسەر دانراوەی خەیاڵ‌و پڕپاگەندەو ئەفسانە بینا بکەن.

بەڵام چاودێرو لێکۆڵەری بێ لایەن سەرسام دەبێت کە چۆن زانایانی شیعە بەدرێژایی مێژوو توێژینەوەی زانستیانەیان پشت گوێ خستوە لەسەر ئەو ڕیوایەتو چیرۆکە ئەفسانەیی‌یانەی کە دانراون بۆ سەلماندنی لەدایک بوون‌و بوونی (ئیمامی دوانزەهەم محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەری)و چۆن پشتیان بەستوە بە ڕیسایەکی نامۆو نا دروست کە گوایە (ڕیوایەتە لاوازەکان یەکتر بەهێز دەکەن)و بەو پێیە مەسەلەی لەدایک بوونیان کردۆتە مەسەلەیەکی سەلمێنراو حەقیقەت کە پێویست بە مراجعەو توێژینەوە نەکات. هەر ئەوەش وای لێ کردوون کە بەردەوام ڕیوایەتەکان بەبێ سەرلێکردنەوەو بیرکردنەوە بڵێنەوە.

دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین مەسەلەیەک نیە لە مێژووی شیعەدا ئەوەندەی مەسەلەی بوونی مەهدی‌و لەدایک بوونی پشت گوێ خرابێت‌و لەدەرەوەی بازنەی باس‌و لێکۆڵینەوە دانرابێت[1].

زۆرێک لە زانایان‌و ڕۆشنفکرانی شیعە کەیفیان دێ کاتێک ڕەخنە لە عەقیدەو باوەڕی لایەنی تر دەگیرێت، کەچی کاتێک ڕەخنەو توێژینەوە پەیوەستە بە باوەڕو بۆچوونی لایەنەکەی خۆیانەوە، چاو دەقوچێنن‌و خۆیان نابەڵەد دەکەن‌و نایانەوێ کەمێک ژیریی خۆیان بخەنە گەڕو حەزیان لەوەیە لەسەر سەرینی کەلەپووری ئەفسانەو خەرافاتی خۆیان لێی بخەون.

هەموو ئەو ڕیوایەتانەی دانراون دەربارەی (محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەری) جیاوازی‌و ناکۆکی‌یەکی هێجگار گەورەیان تێدایە، هەر لە دیاری کردنی پێناسی ئەو ئافرەتەوە کە گوایە دەبێتە دایکی‌و بەرواری لەدایک بوونی‌و تا دەگاتە وردەکاریی‌یەکانی ژیانی.

---

[1] تێبینی: لەناو حەوزەو قوتابخانەکانی شیعەدا ماددەی مێژووی ئیسلامی‌و شیعە بوونی نیە.

• جارێ ناوی دایکی به چەند جۆر هاتووە، جـارێ نـێرگس یـان سۆسـەن یـان ڕێحانـە یـان مـەلیکـەو چـەند نـاوی تـر، ئینجـا هاوسـەری حەسـەنی عەسکەری خۆی کە مەریەمی کچی زەیدی عەلەوییە.

• هەروەها ڕیوایەتەکان جیاوازییان هەیە لە دیاری کردنی بـەرواری ڕۆژو مانگو ساڵی لەدایکبوونی، پاش ئەوە لە دیاری کردنی تەمەنی لـە ساتە وەختی مردنی باوکیدا لەنێوان دووساڵو هەشت ساڵدا.

• دیسان جیاوازییان هەیە لە باسی چۆنیەتی سکپڕبـوون پێیـەوە، لـە ڕەحمو منداڵدانی ئاسایی‌دا بووەیان لە پشتدا پاشـان لـە چۆنیـەتی لـەدایکبوونی‌دا، لە ڕێگای ئاسایی‌یەوە بووە یان لە جێگەیەکی ترەوە.

• ڕیوایاتی جۆراو جۆر سەبارەت بە هەموو ئەو ئەگەرانە هەیە.

• هـەروەها ڕوایـاتی جیاجیـا هەیـەدەربارەی چۆنیـەتی گەشـەکردنو گەورەبوونی ئەو منداڵە سەیرو سەمەرەیە، یان ڕەنگی پێستی لەنێوان سپیو ئەسمەردا.

• ڕیوایـەتی جیاجیـا هەیـە سـەبارەت بـە ئاستی ژیـریو تێگەیشتنی، هەندێکیان دەڵێن لـە سـاتی لـەدایکبوونیدا یەکسـەر سـەجدەی بـردووەو شـایەتمانی هێنـاوەو صـەلاواتی داوە لەسـەر بـابو باپـیرانیو قورئانیشـی وتووە.

• ڕیوایەتی جیاجیـا هەیـە لەباسـی ترسـی گرتنـی لەلایـەن دەسـەلاتو حوکمی ئەو ڕۆژەوە، تا ئەوەی بەوپـەڕی دڵنیایی‌یـەوە بەشـداری ڕێوڕەسمـی بەخاکسـپاردنی بـاوکی کـردووەو نوێـژی لەسـەر کـردووەو پێشـوازی پرسەکەرانی کردووە.

• بەلام سەبارەت بەو چوار کەسەی کە ئیددیعـای نیابـەتیان کـردوە کـە گوایە (ئیمامی غائب)یان دیوەو چاوپێکەوتنیان لەگـەڵ کـردوە، خـەڵکێکی زۆر باوەڕیان پێ کردوون، ئەوە گومان لە هەموو شـتێکیاندا هەیـە. چونکـە لـەو ڕۆژگـارەدا زۆر لـە شـیعە بـەگومان بـوون لێیـانو پرسـیاریان لـە

سەرەنجامی ئەو ماڵو داراییەیە دەکرد کە بەناوی (مەهدی)یەوە کۆیان دەکردەوە.

زۆر جار ئەو نائیبانەیەکتریان بەدرۆ دەستەوەو یەکتریان تۆمەتبار دەکرد بە هەڵبەستنی درۆو دەلەسەو ئەفسانە.

جگە لە کۆمەڵێک ڕیوایەتو چیرۆکی ئەفسانەییدەربارەی ئەوەی کەگوایە ئەو نائیبانە غەیبیان زانیوەو کاری موعجیزاویان کردوە، بەڵگەیەکی مەحکەم نیە کە ئەو چوار کەسە لەنێوان (٢٠) کەسی تردا جیا بکاتەوەو هەموشیان ئیددیعای نیابەتیان کردوە لەو ڕۆژگارەدا.

ئەگەر ئەو چیرۆکە خەیاڵیانە قبوڵ نەکەین، ئیتر شتێکی تر نامێنێتەوە بکرێتە بەڵگە بۆ بەڕاست دانانی ئەو چوارە لەنێوان درۆزنەکانی تردا.گومان لەوەدا نیە کە ئەو چیرۆکو ڕیوایەتانە ئەساسێکیان نیە، چونکە ئەو شتانە بۆ هیچ کەسێک ڕاست نین‌و تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ ئیددیعای نەکردووە، بەڵکو کاتێک موشریکەکان داوایان لێ‌کرد کاری موعجیزاوییان بۆ بکاتو ئاویان لەزەوی بۆ دەربهێنێتو بەئاسماندا سەربکەوێتو کتێبیان بۆ داگرێتە خوارەوە، خوای گەورە پێی ڕاگەیاند بەم شێوەیە وەڵامیان بداتەوە: ﴿قل: سبحان ربي هل كنت الا بشرا رسولا﴾الاسراء/٩٣، ﴿قل: انما الآيات عند الله وانما انا نذير مبين﴾العنكبوت/٥٠.

پێغەمبەر ﷺ ئیعتمادی لەسەر عەقڵو موعجیزەی نەمری قورئان بووە.

کاری موعجزاوی زانینی غەیب پێچەوانەی ئایەتەکانی قورئانە کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە هیچ کەسێک غەیب نازانێت:

﴿عالم الغيب فلا يظهر على غيبه احدا الا من ارتضى من رسول..﴾الجن/

﴿قل لايعلم من في السموات والأرض الغيب الا الله..﴾

هەر لەبەر ئەو هۆیانە بوو کە جەماوەری شیعە جگە لە کۆمەڵێکی کەم لە سەدەی سێیەم چوارەمی کۆچیدا باوەڕیان بە (محەمەدی کوڕی حەسەنی

عەسکەری) نەبووەو مێژوو نووسەکانیان ئەو سەردەمەیان ناو ناوەسەردەمی سەرگەردانی (عصر الحيرة).

ناکۆکی نظریەی بزربوونی ئیمام لەگەڵ فەلسەفەی ئیمامەتدا

پێش هەر شتێک چاک وایە بزانین مەفهومی نظریەی ئیمامەتی ئیلاهی لە دیدی زانایانو فەیلەسوفانی شیعەی ئیمامیەوە چۆنە ؟ ئەوانەی کە خۆیان دایانڕشتووە:

نظریەکە دەڵێت: (زەوی نابێت ڕۆژێک لەڕۆژان بێئیمام بێت و، (ئیمام)یش واتە (خەلیفە یان سەرۆکی باڵا) دەبێمەعصومو دیاریکراو بێت لەلایەن خواوە، شورا بەتاڵەو ئیمام نابێ لەلایەن ئوممەتەوە هەڵبژێررێت. هەروەها ئیمامەت بەشێوەیەکی عەمودی لە بنەماڵەی عەلیو نەوەکانی حوسەین بەردەوام دەبێت تا ڕۆژی قیامەت).

هەر لەسەر ئەم بیرو باوەڕە، ئەو فەسلەسوفانە بڕیاریان دا کە دەبێئیمام حەسەنی عەسکەری کوڕێکی هەبێت، هەرچەند هیچ جۆرە بەڵگەیەکیش نەبوو لەسەر لەدایک بوونی.

هەندێ لە شیعە ڕەفزی ئەوەیان کرد کە جەعفەری برای حەسەن ئیمام بێت، چونکە بەلایانەوە وابوو کە نابێت دوای حەسەنو حوسەین کوڕانی ئیمامی عەلی دوو برا پلەی ئیمامەت وەربگرن، لەبەر ئەوە وتیان ئەبێ حەسەنی عەسکەری کوڕێکی هەبێتو لەخەڵکی شاردبێتەوە.

بەڵام لێرەدا کۆمەڵێک پرسیاری گەورە دێتە ئاراوەو خۆی دەسەپێنێ: ئەگەر ئیمامەت لەو کەسە دانراوەدا کۆبووەتەوە، بۆچی غائب دەبێو نایەتە دەرەوە، بۆ ئەوەی سەرکردایەتی ئوممەت بکاتو حکومەتەکەی خوا لەسەر زەویدا دابمەزرێنێت ؟ مادامەکی زەوی نابێ چۆڵ بێت لە ئیمام، ئیمامی غائبیش ناتوانێ ئەرکو دەسەڵاتی ئیمامەت بەجێ بهێنێ، نهێنیو حیکمەتو غائب بوون چیەو تاکو کەی غائب دەبێتو ئایا ئەرکو واجبی سەرشانی شیعەو خەڵکی لەکاتی غەیبەتدا چیە ؟

بێگومان ئاکامی سروشتیو پێویستی ئەم جۆرە فیکرە، هەر (نظریە)ی چاوەڕوان کردن (الانتظار)و قەدەغە کردنی چالاکی سیاسی لە ماوەی غائب بووندا. ئەوەش ئەو (نظریـە) بـوو کـە چەند سـەدە بـاڵی کێشابوو بەسـەر شیعەداو تا ئێستا هەندێ لە ئاسەوارەکانی درێژەی هەیە، هەرچەند نظریەی (نیابـەی عامـەو ولایـەتی فەقیهـ)یش داهێـنراوە. ئـەو نظریـە میسـالیو خەیاڵیە (چاوەڕوان کردن) بووبە هۆی بەرکەنار بوونی شیعە لە ژیان، چونکە ئیمامیـان نـەبوو، وە ئیمـامی مـەعصومو دیـاریکراویش لەلایـەن خـواوە نەدەهاتە دەرەوە.

ئەمەش ناکۆکیو دژایەتیەکی گەورە بوو لەنێوان فەلسەفەی ئیمامـەتدا کە دەڵێ نابێ زەوی خاڵی بێت لـە ئیمـامی مـەعصومو دیاریکراو لەلایـەن خواوە بۆ جێبـەجێ کردنـی شـەریعەتو سـەرکردایەتی کردنـی موسـڵمانانو وەڵامی گشت گرفتو پرسیارە تەشریعی‌یەکانی ئوممەت بداتەوە.

بەڵام بەداخەوە هەڵگرانو بانگکـەرانی نظریـەی غەیبـەت لـەم بـوارەدا بـەهیچ شـێوەیەک ئامـادە نـەبوون ژیـری بـەکار بهێنـن، چونکـە ئـەوە مەسەلەیەکی عەقڵی ئاساییو بەڵگەنەویستەو ناتوانرێت فەرامۆش بکرێـتو لێک بدرێتەوە بە هەندێ هەواڵو چیرۆکی لاوازو ئەفسانە بابەت.

وە ناتوانرێ پەنا ببرێتە بەر نظریەی ترس بۆ لێکدانـەوەی هـۆی غـائب بوون، چونکە تـرس دوورە لـە ڕەوشتی سـەرکردە بەگشـتیو ئـەهلی بـەیتی پێغەمبەر ﷺ بەتایبەتی، کە شەوقو پەرۆشیان بۆ شەهید بوون لای هـەموان ئاشکرایە.

جگە لەوەش لێرەدا پرسـیارێکی تـر سـەر دەردێنێـت: کـە ئایـا ئەگـەر ڕاستە ئەو کوڕە هەیەو ئیمامە، ئەی دەبێ بۆچـی خـوای خـاوەن دەسـەڵاتو توانا نایپارێزێت لە چنگی دەسەڵاتدارانو دوژمنـان، هـەروەک چۆن مووسا پێغەمبەری (علیه السلام) لە دەستی فیرعەون دەرباز کرد ؟!

ئەمە لەلایەک، لە لایەکی تریشـەوە سیاسـەتی خەلیفـەکانی عەبباسـی لەو سەردەمەدا سیاسەتێکی نەرمو ڕێزلێنان بـووە بەرامبـەر عەلەوییەکان،

بومیهیە شیعەکان دەسەڵاتی تەواویان هەبوو لە پایتەختی خەلافەتدا، دەیانتوانی خەلیفە دابنێن و لاشی بەرن، بۆیە حەسەنی عەسکەری ئەگەر بەڕاستی هەبوایە، ئەیتوانی خۆی ئیعلان بکاتو، بەرهەڵستی دەسەڵاتی لاوازی خەلیفەی عەبباسی بکردایەو دەوڵەتە ئەفسانەییەکەی دابمەزراندایەو ئەرکی ئیمامەتی خۆی بەرامبەر شیعە داماوەکان بەجێ بهێنایە.

هەڵگرانی نظریەی ترس (الخوف): داوایان لە شیعە ئەوە بوو کە ئەو هۆکارانە لابەن کە بۆتە هۆی ئەوەی ئیمامی مەهدی غائب بێت، ئەوەش بەوەی کە زەمینە خۆش بکەن و خۆیان ئامادە بکەن بۆ پشتیوانی لێ کردنی و بەگوێ کردنی.. ئەوەتا ئەمڕۆ ئەو ترسە نەماوەو شیعەکان گشت ئەو هۆیانەیان هەڵگرتووە کە ڕێگربێت لە هاتنە دەرەوەی ئیمام، کەچی هەر نەهاتە دەرەوەو هەرگیزاو هەرگیز نایەتە دەرەوە چونکە لە بنەڕەتدا وجودی نیە.

دوای ئەوەی ڕۆشن بوویەوە کە نظریەی مەهدی منتظرو محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەری هیچ جۆرە وجودو ڕەسیدێکی نیە لە واقیعو لە حەقیقەتدا، ئێستا پرسیارێک خۆی فەرز دەکات:

کەواتە چۆن ئەم نظریە پڕوپوچە توانی ڕێگا ببڕێتو بچێتە دڵو هۆشی ملیۆنەها شیعەوە لە ماوەی چەند سەدەی ڕابردوودا ؟! وە چۆن بوو بە عەقیدەیەکی پتەوو بەهێز؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: لەڕێگای بە ئەنجام گەیاندنی عەمەلیەیەکی ئیعلامیو پروپاگەندە کردنێکی گەورەو درێژ خایەنەوە کە هەڵگرانی ئەو نظریەو هاوکارەکانیان پێی هەستانو ئاسەوارەکانیشی تا ئەمڕۆ هەر بەردەوامە.

گرنگترین پایەکانی ئەو عەمەلیە ئیعلامیە گەورەیە لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورت دەکرێنەوە:

١- هەڵبەستنی ڕیوایەتو حەدیسی جیاجیا بە ژمارەیەکی زۆر.

٢- ئیرهابی ئیعلامیو تۆمەتبار کردنی نەیاران بە کوفرو ڕەدەو فسـقو ضلال.
٣- دوعاو نزاو پاڕانەوەو زیارات لە گشت بۆنەکاندا ئەوەش دوو بەشە:
(ا) کۆمـەڵێک دوعـاو نـزای هەمـە بابەتـە کـە بـە دەوری مـەهدیو پێشەوایانی پێشینەدا دەسوڕایەوە بەشێوەیەکی گشتی.
(ب) کۆمەڵێک دوعای تایبەت : مەهدی کـوڕی حەسـەنی عەسـکەری سەردانی ئەو سەردابەی کە خۆی تێدا شاردۆتەوە لە سامەڕا.
٤- چەندەها طقوسو چیرۆکی ئەفسانەیی سەبارەت بە بینینی مەهدی.
بەم شێوەیە پروپاگـەندەی هەمـە جۆرو بـەردەوام ڕۆڵێکـی کاریگـەری هـەبوو لـە جێگـیر کـردنو سـەلماندنی نظریـەی مـەهدی منتظـرداو لـەناو جـەماوەری عـوامی شـیعەدا ڕیشـی داکوتـاو بووبـە حەقیقـەتێکی بەڵگەنەویستی وەها کە گفتوگۆی لەسەر نەکرێت.

# بەشی سێیەم

## ئاسەوارە سەلبییەکانی نظریەی دوانزە ئیمام

### هەڵوێست بەرامبەر چالاکی سیاسی

لە بەشی دووەمی ئەم باسەدا ڕوونمان کردەوە کە نظریەی دوانزە ئیمام کە لە ئاکامی فرضیەتی محمدی کوڕی حەسەنی عەسکەریو مەهدی منتظرەوە هاتە کایەوە، کاریگەری گەورەی هەبوو لەسەر فیکری سیاسی شیعەو بۆ چەند سەدەیەک گۆشەگیرییەکی تەواوی لەخۆ گرتبوو، بە هۆی حەرام کردنی کاری سیاسیو هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا. چونکە ئاشبە تایبەتەکانی ئیمامی دوانزەهەم بە هیچ شێوەیەک چالاکی سیاسییان نەدەکردو بیریان لە هیچ جۆرە بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی نەدەکردەوە، لەکاتێکدا شیعەی زەیدیەو ئیسماعیلیە خەریکی دامەزراندنی دەوڵەت بوون لە یەمەنو باکووری ئەفەریقا.

نظریەی چاوەڕوان کردن (الانتظار) بۆ ئیمامی بزر بوو بەمانا سەلبییە مرتڵەقەکەی ڕووەکەی تری نظریەی ئیمامی مەعصومو دیاریکراو لەلایەن خواوە بوو، هەر بۆیە هەڵگرانو لایەنگرانی ئەم نظریەیە هەڵوێستی سەلبییان هەبوو لە کاری سیاسیو سووربوون لەسەر هەڵوێستی چاوەڕوان کردن تا کاتێک مەهدی دێتە دەرەوە.. هۆی سەرەکی غائب بوونی شیعە لە حوکمڕانی کردنی عیراقو دواکەوتنیان لەو بوارەدا کە تا ئەمڕۆ ئاسەواری هەیە هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی چاوەڕوان کردنی ئیمامی غائبو هەڵوێستی سەلبییان لە کاری سیاسیو حکومەتداری.

هەرچەندە لەو ڕۆژگارەشدا لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا بوەیهییەکان دەسەلاتیان گرتبوو بەسەر دەوڵەتی عەبباسیداو دەستیوەردانیان دەکرد لە کاروباری خەلیفەکاندا، کەچی زانایانی ئیمامی دژی هەموو جۆرە چالاکییەکی سیاسی بوونو پێیان وابوو: ((لن امر الوصية والامامة بعهد من الله تعالى واختياره، لا من خلقه ولا باختيارهم ، فمن اختار غير

مختار الله وخالف امر الله سبحانه و رد مورد الظالمين والمنافقين الحالين في ناره )) من كتاب (الغيبة) لمؤلفه محمد بن ابي زينب النعماني المتوفي سنة ٣٤٠ هـ/ص٥٧.

هەر لەسەر ئەو ئەساسە بەیعەت کردنی غەیری پێغەمبەرو ئیمامی هەقیان بە ناڕەوا دەزانی لە سەردەمی ئامادە نەبوونی ئیمامداو بەجۆرێک لە شیرکو بیدعەی حەرامکراویان دادەنا کە سەرەنجامی لەعنەتو پەشیمانیە.

## هەڵوێست بەرامبەر (اجتهاد) کردن

بێگومان لایەنگرانو شوێنکەوتوانی نظریەی ئیمامەت ئامادە نەبوون هیچ کەسێک لەبری ئیمامی غائب پێشوایەتی بکات با ئەو کەسەش زاناو فەقیهێکی عادل بێت، چونکە ئیجتیهاد کردنو کارکردنیان بە قیاسو بەڵگەکان حەرام کردبوو، وە بوونی زانستی یەقینی بە ئەحکامی دینیان کردبویە مەرج و، کە لەغەیری بنەماڵەی مەعصومی پێغەمبەردا ﷺ نیە، ئەویش بەپێی ئەو ڕیوایەتو هەواڵانەی کە بەحسابی خۆیان پێیان گەیشتووە.

ئەوەش بۆ ئەوەی خۆیان بگونجێنن لەگەڵ نظریەی ئیمامەتی خواییدا کە هەردوو پرۆسەی تەشریعیو تەنفیذی تایبەت دەکات بەو ئیمامانەوە کە مەعصومنو لەلایەن خواوە دیاری دەکرێن.

باوەڕیشیان وابوو کە زانستی ئەهلی بەیت زانستێکی یەقینیە وەک عیلمی پێغەمبەر ﷺ وایە کە لەلایەن خواوە ڕاستەوخۆ بۆی هاتووە، پشتی نەبەستووە بە لێدەرهێنانو ئەنجام گرتنو بەڵگە هێنانەوە.. بەم پێیە سەرچاوەکانی (ئەحکام)یان لەم سێ سەرچاوەیەی خوارەوەدا دەبینیەوە:

١- قورئان.

٢- سوننەت.

٣- وتەکانی پێشەوایانی ئەهلی بەیت.

دەیان وت قورئانو سوننەت کۆتایی‌یان هەیە، بەڵام ڕووداو کاروبارەکـان کۆتایی‌یـان نیـە، بۆیـە پێویسـتە لەلایـەن خـواوە ئیمـام دیـاری بکرێـت کـە پارێزراو بێت لە هەڵەو گوناهـو، لەلایەن خواوە زانیاری وەربگرێ بـۆ ئـەوەی شەریعەت بپارێزرێتو ئەحکامی دین فێری موسڵمانان بکات.

هەر لەم ڕوانگەیەوە بوو ڕەفزی ئیجتیهادو موجتـەهیدەکانیان دەکـردو، ئیجتیهـادو تـەقلیدیان قەدەغـە کردبـوو، هـەروەها پێیـــان وابووکـە هیـچ ڕێگایەک دروست نیە بۆ وەرگرتنـی ئـەحکامی شـەرعی - ئـەصڵی بـن یـان فەرعی- جگە لە ڕێگای گـوێ گرتـن بـۆ ئیمامـەکان و، هـەرگیز ئـەحکامی شـەرعی نـابێ لـــە ڕواڵــەتی قورئـــانو فـــەرموودەکانی پێغەمبـــەرەوە ﷺ دەربهێنرێ.

## هەڵوێست بەرامبەر ولایەتی فەقیه

دوای قەدەغە کردنو حەرام کردنـی ئیجتیهـاد لەسـەردەمی غەیبـەتدا، مەسـەلەیەکی بەڵگەنەویسـت بـوو کـە هەڵوێسـتێکی سـەلبی وەربگـرن لــە ویلایـەتی فەقیهـ چونکـە مـەرجی بوونـی زانسـتی خوایـیو عیصمـەت لــە زانایانو موجتــەهیدەکاندا نیـە، بۆیــە نظریــەی ولایــەتی فەقیهیشـیان ڕەت کـردوە، چونکـە نظریـەی ولایـەتی فەقیهــ بــەندە لەســـەر ئیجتیهـــادو، ئیجتیهادیش تایبەتە بە ئیمامی مەعصومەوە.

بۆیە ئەو هەڵوێستە سەلبییەی کە وەریانگرت بەندبوو لەسەر دوو شت:

**یەکەم:** ئیمـان بـە بوونـی مـەرجی عصمـــەتو علمـــی خوایـــیو دەق سەبارەت بە ئیمام، کـە ئـەویش مـەهدی منتظـرو محمـدی کـوڕی حەسـەنی عەسکەرییە.

**دووەم:** ئیمان بە حـەرام بوونـی ئیجتیهـادو هەڵســانی غـەیری ئیمـامی مەعصوم بە کاری سیاسیو ولایەت.

## هەڵوێست لە پرۆسەی چاککردنی کۆمەڵایەتی

نظریەی چاوەڕوان کردنـی ئیمـامی غـائب کاردانـەوەی سـەلبی هـەبوو لەسەر زۆربەی لایەنەکانی ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو لەپێش هەموویانەوە

یاسای (الامر بالمعروف والنهی عن المنکر) واتە پرۆسەی چاککردنی کۆمەڵایەتی کە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە بۆ ڕێگرتن لە فەسادی ناوخۆو بەرهەڵست کردن لە دەست درێژ بوونی خراپکاران بەسەر موسڵماناندا ئەوەش جیهادی سیاسیو ئیعلامی دەگرێتەوە دژ بە ستەمکارانو لادەران لەلایەن ئوممەتەوە.

هۆکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە هەر جۆرە کارێک لەو بابەتە بە صلاحیاتی ئیمامی مەعصوم دەزانن کە مەهدی منتظرەو بە ئەرکو دەسەڵاتی ئوممەتی نازانن، هەر ئەم باوەڕو بۆچوونە سەلبی‌یە بوو بە هۆی کشانەوەی شیعە بە جەماوەرو زانایانەوە لە گۆڕەپانی کاری سیاسیو کۆمەڵایەتی‌دا.

## حەرام کردنی جیهاد (قتال) لەسەردەمی غەیبەتدا

هەر هەمان باوەڕبوون بە نظریەی چاوەڕوانکردن بەدیار ئیمامی مەعصومەوە، وەک مەرجی واجب بوونی جیهاد، بوو بە هۆی هەڵگرتنی جیهادو جەنگ لە دژی دوژمنانو داگیرکەران، هەر ساتێک ئیمام ئامادە نەبێت بۆیان دروست نیە کە بەبێ فەرمانی ئیمام جەنگ بکەن.

بۆیە جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەمی زانایانی شیعە نەبێت بە ئیجماع ڕایان لەسەر ئەوە بوو کە بەبێ ئامادە بوونی ئیمامی مەعصوم (جیهاد) بەمانای (القتال) حەرامەو تەنانەت لای هەندێکیان ڕەوابوو کە شیعەکان لە کەنار کافرانەوە لە دژی فەرمانڕەوایانی موسڵمانەکاندا بجەنگێن.

بێگومان ئەم هەڵوێستە سەلبیو نامۆیە لەسەر بناغەی نظریەی ترقبو چاوەڕوان کردن بنیات نرابوو کە هەڵقوڵاوی ئیمان هێنانە بە نظریەی بوونی ئیمامی مەهدی منتظر محمد کوڕی حەسەنی عەسکەریو غائب بوونیو ڕاگرتنی گشت ئەرکو دەسەڵاتەکانی دەوڵەت تا دێتە دەرەوە، کە پێیان وابوو بۆ کەسیش نیە ئەرک دەسەڵاتەکانی ببینێت.

بەم هۆیەوە شیعەی ئیمامی لە ماوەی زیاتر لە یەک هەزار ساڵدا هیچ جۆرە بەشداریەکی ئیجابی‌یان نەبووە لە جیهادو، بەرگری کردن لە ئیسلام

موسڵمانان لە بەرامبەر ئەو هەموو پەلاماردانو هێرشە دوژمنکاریانەی دەکرایە سەر وڵاتی ئیسلام لەلایەن دوژمنانەوە، بگرە زۆر جاران هەڵوێستی خیانەتکاریو هاوکاری کردنیان هەبووە لەگەڵ دوژمنانـدا دژ بە خەلافەتی ئیسلامیو دەسەڵاتداریتی موسڵماناندا.

## هەڵوێست لە نوێژی جومعە

نوێژی جومعە دوور لە ڕەنگدانەوەی سەلبی نظریەی (الانتظار) چاوەڕوانکردن تا ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی. لەوەبەر لە سەدەکانی سێیەمو چوارەمدا هیچ نەوتراوە دەربارەی هەڵگرتنی نوێژی جومعە، بەڵام لەم دواییەدا ئامادە بوونی ئیمام یان مۆڵەت دانی کرایە مەرجی بەجێهێنانی نوێژی جومعە، لە ئەنجامی ئەوەدا وتیان کەواتە لەکاتی غائب بوونی ئیمامدا نوێژی جومعە واجب نیە.

## هەڵوێست لە زەکاتو پێنج یەك

جگە لە ڕاگرتنی هەموو ئەو ئەرکو کارە گرنگانەی کە باسمان لێ کردن لە سەردەمی غەیبەتی ئیمامدا، لایەنە ئابوورییەکانی زەکاتو پێنج یەکو ئەنفالو خەراجیش کە پەیوەستە بە دەوڵەتەوە ڕاگیرا و کاری پێ نەدەکرا.

سەبارەت بە زەکات بەتەواوی پەك نەخرا، بەڵکو هەندێ لایەنی صرف کردنی وەستێنرا، ئەوەش ئەو بەشانەی بوو کە تایبەتن بە دەوڵەتەوە، واتە لەسێ ڕووەوە مامەڵەیان لەگەڵ زەکات کرد:

- لەلایەکەوە زەکاتیان بە واجب دادەنا.
- لەلایەکی ترەوە دەسەڵاتیان دا بە ئەو کەسانەی زەکاتیان لەسەرە کە خۆیان هەڵسن بە دابەش کردنی.
- جگە لە بەشەکانی (العاملین علیها والمؤلفة قلوبهم وفي سبیل الله (الجهاد)) کە ئەرکی دەوڵەتەو ئەبێ ڕاگیرێ تا ئیمامی غائب دەردەکەوێت.

بەلام بەنیسبەت پێنج یەکێو ئەنفالەوە پێیان وابوو کە تایبەتە بە خواو پێغەمبەرەوەو دوای ئەویش تایبەتە بە ئیمامی عادلەوەو هەر کەسێك بە ئیزنی ئەویش ئیشی تێیدا بکات ئەو چواریەکی بۆ ئەوەو پێنج یەکەکەی تری بۆ ئیمام خۆیەتی.

ئیمامی عادلیش لای ئەوان واتە ئەو ئیمامە مەعصومەی کە لەلایەن خواوە دیاری کراوە کە ئەویش محمەدی کوڕی حەسەنی عەسکەری وەك باوەڕیان وایە.

بۆیە زاناکانیان لە بەرامبەر ئەم مەسەلەیەوە سەرگەردان بوونو هەر کۆمەڵێکیان ڕاو بۆچوونێکی هەبوو:

- هەندێکیان لە کاتی غائب بوونی ئیمامدا بە (واجب)یان نەدەزانی.
- هەندێکی تریان پێیان وابوو واجبە هەڵبگیرێتو دفن بکرێت تا کاتی دەرکەوتنی ئیمام ئەگەر مەترسی مردنی هەبوو ئەوا وەسیەت دەکات بۆ کەسێکی متمانە بۆ ئەوەی تەسلیمی ئیمامی بکات.
- هەندێکی تریان پێیان وابوو کە دەتوانن بۆ هەژارانی شیعەو منداڵەکانی خۆی بەکاری بهێنێت.

# بەشی چوارەم

# سەرەتای هەنگاوەکانی دەرچوون لە قەیران

## کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد

وەک لە بەشەکانی پێشەوە ڕوونمان کردەوە کە نظریەی چاوەڕوان کردنی ئیمامی بزربوو، بووبە هۆی بزر بوونی شیعەی ئیمامی لە گۆڕەپانی ژیانی سیاسی، ئەوەش لە ئەنجامی حەرام کردنی کاری سیاسیو هەوڵدان بۆ دامەزراندنی دەوڵەت لەسەردەمی غەیبەتدا. بەڵام ئەم دیاردەیە بوو بەهۆی جیابوونەوەی بەشێک لە شیعە بەشێوەیەکی کردەیی لە فیکری ئیمامی کە عصمەتو دەق دەکاتە مەرجی ئیمام و، بەشێوەیەک لە شێوەکان مومارەسەی دەسەڵاتی سیاسییان دەکرد. چونکە سەلبیەتی نظریەی چاوەڕوانی ئیمام لەم بوارەدا لە ئاستێکدا بوو، پابەند بوون پێیەوە ئەستەم بوو لە ژیانی واقعیدا. لە ئەنجامی ئەو قەیرانەدا ژمارەیەک لە زانایانیان لە فیکری ئیمامی پاشگەز بوونەوەو کەم کەم وازیان لەو کۆتو پێوەندە هێنا کە پێیەوە بەسترابوونەوە، یەکەم هەنگاو لەم ڕێگایەدا بریتی بوو لە کردنەوەی دەرگای ئیجتیهاد کردن.

دوای پەیدا بوونی قۆناغی یەکەمی غەیبەت (الغیبة الصغری)و درێژ بوونەوەی سەردەمی غەیبەتی گەورەو دابڕان لە سەرچاوەی زانستی خواییو هاتنە کایەی چەندەها مەسەلەو کێشەی نوێ کە وەڵامو ڕێگاچارەی دەویست، هەڵوێستی زانایانی ئیمامی لە مەسەلەی ئیجتیهاد دەستی کرد بە گۆڕانو ناچار بوون دەرگای ئیجتیهاد کردن بکەنەوەو ڕێگا بدەن بە کارکردن بە قیاس.

ئەم دەرگا کردنەوەیەی ئیجتیهاد لە ناوەڕاستەکانی سەدەی چوارەمی کۆچییەوە دەستی پێ کردو کەم کەم قوتابخانەی ئیجتیهاد بەهێز بوو لە بەرامبەر قوتابخانەی ئەخباریەکانەوە، تا لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا (المحقق الحلي) توانی بەرهەڵستی ئەخباریەکان بکاتو لە بازنەی دەقەکانو

فەرموودەکان دەربچێتو ڕایگەیاند کە: دروستە کارکردن بە فەتوای زانا لە ئەحکامە شەرعیەکاندا.

بەڵام لەبەر ئەوەی کردنەوەی دەرگەی ئیجتیهاد بۆنی ئەوەی لێ دێت کە پێویستی بە ئیمام نەمێنێت، ناچار پەنایان بردە بەر (نظریە اللطف) کە مانای ئەوە دەگەیەنێ کە ئیمامی بزربوو لەپشت پەردەوە بەشێوەیەکی تایبەتی سەرپەرشتی پرۆسەی ئیجتیهاد دەکاتو ڕاو بۆچوونەکانیان ئاراستە دەکاتو هەڵەکانیان بۆ ڕاست دەکاتەوە.. بەڵام زانایانی ئەم دواییەیان گوێیان بەم نظریەیەش نەدا چونکە لە ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵدا، بەهیچ شێوەیەك هەستیان بەو مەسەلەیە نەکردووە، تەنانەت لە یەك مەسەلەشدا. ئەوە بوو ئیمام خومەینی یەکێ بوو لەوانەی کە دەرگای ئیجتیهادی بە فراوانی کردەوە تەنانەت لە کۆتایی ژیانیدا دەرگای ئیجتیهادی بەتەواوەتی کردەوەو ڕایگەیاند کە وەلی فەقیه بۆی هەیە لە بەرامبەر دەق (النص)ەوە ئیجتیهاد بکاتو بگرە (دەق) فەرامۆش بکات ئەگەر بەرژەوەندی گشتی خواستی بەو پێیەی دەسەڵاتدار دیاری دەکات، کە ئەوەش ئەنجامی خەتەرناکی لێ دەوەشێتەوە.

بەڵام هەرچۆنێك بوو کردنەوەی دەرگەی ئیجتیهاد هەنگاوێکی گەورەبوو بۆ دەرچوون لەو قەیرانەی شیعە تێی کەوتبوونو ڕێگا کرایەوە بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی تەشریعیو چاوگێڕانەوە بە زۆربەی بوارەکانی فیقهداو پاڵی پێوەنان بۆ خۆ دەرباز کردن لە ترقیەو چاوەڕوانیو مەرجە تەعجیزیەکانی ئیمامەتداو دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ دامەزراندنی حکومەت.

## نیابەتی ئیمام لەبواری قەزادا

ئەم نظریەیە هەڵقوڵاوی چەن ڕیوایەتێکە لە ئەهلی بەیتەوە کە ئاماژەی تێدایە بۆ ئەوەی زانایانی شیعە لەژیانی خۆیاندا مومارەسەی قەزاو دادوەری بکەن، لەوانە:

ڕیوایەتێکە لە ئیمام جەعفەری صادقەوە کە دەڵێت: (لنظروا الى رجل منكم قد روى حديثنا ونظر في حلالنا وحرامنا فارضوا به حكما فاني قد جعلته عليكم حاكما )رسائل الشيعة/العاملي / ج١٨/باب١١/ص٩٩.

لەسەر ئەم ئەساسە شیعە گرفتی قەزاو دادوەرییان چارەسەر کرد لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامداو لەمەوە نظریەی (النيابة الواقعية عن الامام المهدى) دەرهێناو وتیان هەر کەسێک لە ئەهلی حەق (واتە: شیعەبێت) لەلایەن دەسەڵاتداری ستەمکارەوە (هەر دەسەڵاتدارێک کە لەلایەن ئیمامی مەهدییەوە دانەنرابێت) کرایە ئەمیر ئەوا لەڕاستیدا لەلایەن ئیمامی مەهدییەوە کراوە بە ئەمیرو بۆی هەیە بەو کارە هەڵسێ‌و مۆڵەت دراوە.

لەو ڕوانگەوە یەم نظریەیان داناو ناویان نا (النيابة الواقعية عن الامام المهدي) وەک سەرەتایەک بۆ دەرباز بوون لە ئەشکەوتی غەیبەت بوونو هۆکارێکی گەورەبوو، یارمەتی دان بۆ دانانی نظریەی (النيابة العامة)و (ولاية الفقيه) لەم دواییەدا.

## هەڵوێست لە زەکات

لە بەشەکانی پێشوودا ئاماژەمان بەوە کرد کە لە مەسەلەی زەکاتدا تەنها ئەو بەشەیان حەرام کرد کە تایبەتە بە حکومەتەوە، چونکە بەلای شیعەوە دامەزراندنی حکومەت لەکاتی غائب بوونی ئیمامدا کارێکی حەرامە. چونکە زەکات بەلایانەوە ماڵێکی تایبەت نیە بە خاوەنەکەی بەڵکو تایبەتە بە ئیمامەوە. ئەوەبوو ڕێگایان دا بە ئەوەی کە ئەو بەشانەی تایبەتن بە (الفقراء والمساكين وابن السبيل...) بدرێت بە فەقیهـ لە کاتی غائب بوونی ئیمامدا نەک بەو ئیعتبارەی کە نائبی ئیمامە، بەڵکو بەو ئیعتبارەی کە باشتر ئاگادارە بە چۆنیەتی دابەش کردنی..

لەم ڕووەوە مەسەلەی زەکات لەسەردەمی غەیبەتدا دەرچەیەک بوو کە زانایانی شیعە لێیەوە توانییان خۆیان لە نظریەی ترقیەو چاوەڕوانی ڕابپسکێننو بەرەو نظریەی نیابەی عامەو ولایەتی فەقیهـ بڕۆن.

## مەسەلەی پێنج یەك (الخمس)

بەپێی نظریەی ترقیەو چاوەڕوانی؛ پێنج یەک مافی ئیمامی مەعصومەو لەسەردەمی غائب بوونی ئیمامدا حەلاڵی شیعە خۆیانە، بەڵام هەنگاو هەنگاو لە نظریەکە کشانەوە، هەنگاوی یەکەم ئەوەبوو وتیان پێنج یەک واجبە لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا، بەڵام دەبێ دفن بکرێتو هەڵبگیرێت تا ئیمامی مەهدی دێتە دەرەوەو دوای مردنی خاوەنەکەی وەسیەت بکات بۆ کەسێکی تر تا کاتی هاتنە دەرەوەی ئیمام.

پاشان وتیان نیوەی پێنج یەکەکە (نصف الخمس) لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا بدرێت بە نائبەکەی ئەوەش ئەو موجتەهیدەیە کە گشت مەرجەکانی تێدایەو دەیگەیەنێت بەو کەسانەی کە پێیان دەشێت.

لەکۆتاییدا لەم بوارەدا هەڵسان بە شۆڕشێک. کاتێک بڕیاریان هاتە سەر ئەوەی کە لەکاتی غائب بوونی ئیمامدا نابێ بدرێ بە ئیمام چونکە هەڵناسێت بە ئەرکی ئیمامەت، بۆیە وتیان پێویستە بدرێت بە کەسێک کە بتوانێ وەری بگرێتو دابەشی بکات بەسەر ئەوانەدا کە شیاون و، لە ئاکامدا گەیشتنە ئەوەی کە پێویستە پێنج یەکی ئیمام بدرێت بە (فەقیهـ) نەک لەبەر ئەوەی کە جێگری ئیمام مەهدییە؛ بەڵکو بەشێوەیەکی سەربەخۆو مافی صەرف کردنیشی هەیە.

## هەڵوێست لە نوێژی جومعە

شیعەکان تا ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی نوێژی جومعەیان دەکرد بەتایبەتی لەشاری بەغدا. بەڵام باوەڕهێنانیان بە نظریەی ترقیەو چاوەڕوانی ئیمامو مەرجی ئامادەبوونی ئیمامی عادل یان مۆڵەتدانیو لێکدانەوەی ئیمامی عادل بە ئیمامی مەعصوم کە مەهدی (منتظر)ە، بوو بەهۆی ڕاگرتنی نوێژی جومعە لەکۆتایی سەدەی پێنجەمو شەشەمداو چەند فەتوایەک دەرکرا سەبارەت بە حەرام بوونی بەجێهێنانی نوێژی جومعە لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا.

بەڵام ئەم ڕاگرتنە جێگیر نەبوو و زۆری نەخایاند، چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی نظریەی نیابەتی عامەدا لەسەدەی حەوتەو هەشتەمی کۆچی‌دا، هەندێ لە زانایانی شیعە دەرچەیەکیان دۆزیەوە بۆ خۆدەرباز کردن لە زیندانی نظریەی ترقیەو چاوەڕوانی‌و وتیان زانایان (الفقهاء) دەتوانن نوێژی جومعە بەجێ بهێنن لەبەر ئەوەی نائبی گشتی ئیمامی مەهدین.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە زانایانی شیعە هەڵوێستی کراوەیان بەرامبەر نوێژی جومعە نەبوو بۆیە شیعەکان بەگشتی بەجێیان نەدەهێنا بەهۆی جیاوازی ڕاو بۆچوونی زانایانەوە سەبارەت بە جمعە ئەوەش بەهۆی ئامادە نەبوونی ئیمامی عادلەوە کە مەهدی منتظرە یان بەلای کەم مۆڵەتی تایبەتی جێگرەکەی لەنوێژدا. هەروەها لەبەر ئەوەش بوو کە هێشتا نظریەی ولایەتی فەقیە بەتەواوی گەڵاڵە نەبوو بوو بەشێوەیەک گشت بوارەکان بگرێتەوە.

## گۆڕانکاریەکانی بواری دەستووری

### نظریەی نیابەی عامە

لەبەشی پێشوودا باسمان لە هەوڵەکانی خۆ قوتار کردن لە تەنگژەی چاوەڕوان کردنی ئیمامی غائب کرد، کە زانایانی شیعە خۆیان تێ بەند کردبوو.. بەڵام ئەو هەوڵانە پچڕ پچڕو هەنگاو بە هەنگاو بوو، نەگەیشتە ئەو ئاستەی گرفتەکە بەشێوەیەکی ڕیشەیی چارەسەر بکات، چونکە مەسەلەی (ئیمامەتو غائب بوون) هەر لە ڕیشەوە نەخرایە بەر باس‌و لێکۆڵینەوەو توێژینەوە. لەگەڵ ئەوەشدا زاناکانیان هەوڵیان دا نظریەیەکی سیاسی بەدیل بهێننە کایەوە، ئەوەش بە فەرز کردنی نظریەی نیابەی واقیعی لەلایەن ئیمامی مەهدی‌یەوە، کاتێک حاکمێکی ستەمکار (بەڕای شیعە) فەرمان دەربکات بۆ کەسێکی شیعە ببێتە کاربەدەستی دەوڵەت.. ئەم نظریە سادەو ساکارە لەسەرەتای سەدەی پێنجەمی کۆچیەوە دانرا، گەشەی کردو بوو بە

نظريەيەكی سياسی تەواو لەكۆتايی سەدەی چواردەهەمی كۆچی‌دا بەناوی (ولايەتی فەقيهـ)ەوە.

## نظريەی نيابەی مەلەكی (نظرية النيابة الملكية)

لەكاتێكدا نظريەی نيابەی عامە كەم كەم لەسەر خۆ گەشەی كرد، لەشاری تەبريزی باكوری رۆژئاوای ئێران، بزووتنەوەيەكی صۆفيگەری توركمانی سەری هەڵداو مەزهەبی دوانزە ئيمامی شيعەی وەرگرت بە سەرۆكايەتی لاوێكی بچكۆلەی چواردە ساڵان بەناوی (ئيسماعيل كوڕی صفی الدين كوڕی حەيدەر)كە دامەزراندنی دەوڵەتی صەفەوی ڕاگەياند لەسەرەتای سەدەی دەيەمی كۆچی‌دا، واتە لەساڵی (٩٠٧)ی كۆچی‌دا لەشاری تەبريز.

ئەم سەركردە لاوە قوتبی صۆفيەكان بوو و، ئەو نازناوەی لە باوكی‌يەوە بۆ مابوويەوەو بەرەچەڵەك دەگەڕايەوە سەر بنەماڵەی عەلەوی‌يەكان.. پەيوەندی بوون بە ئەهلی بەيتی پێغەمبەرەوە ﷺ لەلای صۆفيەكان پلەو مەقامی تايبەتی خۆی هەيە.

كاتێك صۆفيەكان ويستيان جموجوڵی سەربازی دەست پێ بكەن بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێكی تايبەت بە خۆيان، سەيريان كرد نظريەی چاوەڕوان كردنی ئيمامی مەهدی نەگونجاوەو واقيعی نيەو كۆسپە لە ڕێگای گەيشتن بە ئامانجەكانيان، بۆيە ئيجازەيان بە خۆيان دا كە دەسەلات بگرنە دەستو ئەركو دەسەلاتی ئيمام بەجێ بهێنن بە تەواویو توانی‌يان دەوڵەتەكەيان وەك دەوڵەتێكی عەقائيدیو پابەند بە ئيمامی دوانزەهەمەوە بخەنە ڕوو.

ئەوە بوو شا ئيسماعيل وای ڕاگەياند كە گوايە لەلايەن ئيمامی مەهدیو ئيمامی عەلی‌يەوەمۆڵەتی وەرگرتووە، بە پشت بەستن بە چيرۆكێكی ئەفسانەيیو خەونێك:

ئەوەبوو ڕۆژێك لەگەڵ كۆمەڵێك لە صۆفيەكاندا لە دەرەوەی شار بوون بەمەبەستی ڕاو كردنو لەنزيك ڕوبارێكەوە، داوای لێ كردن ڕاوەستنو خۆی بەتەنها لە ڕوبارەكە پەڕيەوەو چووە ناو ئەشكەوتێك، پاش ماوەيەك هاتە

دەرەوەو شمشێرێکی بە قەدەوە گرتبوو، وای ڕاگەیاند بەهاوڕێکانی کە چاوی کەوتووە بە ئیمام زەمان لەناو ئەشکەوتەکەداو پێی وتووە کاتی هاتنە دەرەوە نزیک بۆتەوەو پشتێنەکەی توند کردۆتەوەو ئەم شمشێرەی پێداوەو پێی وتووە برۆ ئەوا مۆڵەتم پێ داویت.

دوای ماوەیەکی تر خەونێکی بۆ گێڕانەوە کە گوایە لە خەودا ئیمامی عەلی دیوەو داوای لێ کردوە کە دەوڵەتی شیعە ئیعلان بکات.. دوای ئەوە لەرۆژێکی جومعەدا گەمارۆی مزگەوتی گەورەی تەبریزی داو ئیعلانی دەوڵەتی کرد لەسەر ئەساسی مەزهەبی شیعەی دوانزە ئیمامی، بە پشت بەستن بەم دوو دەعوایەوە:

- دەعوای وەکالەتی تایبەتی لەلایەن ئیمامی مەهدییەوە.
- دەعوای بینینی ئیمام عەلی لەخەودا.

نووسەری کتێبی (ئێران لەسەردەمی صەفەویەکاندا) [راجر سیوری] لەلاپەڕە (٢٦)دا دەڵێت: صەفەویەکان لە ئیعلان کردنی دەوڵەتەکەیاندا پشتیان بە هەمان بیرۆکەی (الحق الالهی) بەست بوو کە پادشاکانی ئێرانی لەپێش ئیسلامدا باوەڕیان پێی هەبوو پێش حەوت هەزار ساڵ.. ئەوە بوو صەفەویەکان لە دوو سەرەوە خۆیان بەخاوەنی ئەو حەقە دەزانی، چونکە لەلایەکەوە ئێرانین و لەلایەکی ترەوە لە بنەماڵەی ساداتن کە دەگەڕێنەوە سەر ئیمامی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی کە کچەکەی یەزد جوردی خواستو ئیمام زین العابدین لەو ژنەیە. بەم پێیە هەردوو حەقەکەیان لا کۆ بووەتەوە؛ حەقی ئەهلی بەیت لە خەلافەتدا بەپێی نظریەی ئیمامەتو حەقی پادشایانی ئێرانی، ئەوە جگە لە نیابەتی ئیمامی مەهدی.

پێشینەی صۆفیگەری یارمەتی (شا ئیسماعیل)ی دا بۆ ئەوەی دەم لە کەشفو پەیوەندی تایبەت بە ئیمامەکانەوە بداتو باس لەوە بکات کە ڕاستەوخۆ تەعلیماتیان لێ وەردەگرێ.. بەم شێوەیە دەسەلاتی دینیو دنیایی موتڵەقی بەخۆی ڕەوا دەبینی.

بێگومـــان دەوڵــەتی صەفــەوی کۆمــەڵێکی تــر بیدعــەو طقــوسو ئینحرافاتو دروشمی توندڕەوی‌یــان داهێنــا کــە بەتــەواوی شــیعەیان بــەدناو کــرد، وەک جنێــودان بــە هەرســێ خەلیفەکــەی ڕاشــدین لەســەر مینبــەرو لەڕێگاوباندا کە ئــەوەش پێچەوانــەی ڕێبــازی ئــەهلی بــەیتی پێغەمبــەرەوە، هەروەها لە بانگدانا شەهادەی سێیەمیان زیاد کرد (اشهد ان عليا ولي الله) جگە لە توند ڕەوی لە زیندو کردنەوەی عاشــوراو بۆنــەکاندا وەک لــەخۆدانو زورنا لێدانو دانانی پارچە بەردەکە (التربة) لــە جێگــەی ســوجدەدا لــەکاتی نوێژکردندا کە تا ئەمڕۆش شیعەکان لەسەر بەرنامەی صەفەویەکان دەڕۆن.

خراپترین ئیش کە پێــی هەســتان ئــەوە بــوو کــە بــەزۆر داوایــان دەکــرد خــەڵکی بــبن بــە شــیعەو لــەوپێناوەدا بــە هــەزارانیان لــە زانایــانو خــەڵکی موسڵمانی ئەهلی سوننەت شەهید کرد، ئەوەش بوو بــەهۆی کاردانەوەیــەکی تونــدو تیــژ لەلایــەن دەوڵــەتی عوسمانی‌سوننی‌یەوەو لــە ئاکــامدا یــەکێتی ئوممەتی ئیسلامی لێک ترازاندو ڕقو کینەی گاتفی لەنێوان شیعەو سوننەدا بنجی داکوتا کە تا ئەمڕۆ بەردەوامە.

لێرەدا مەبەستمان دراسە کردنی مێــژووی صەفەوی‌یــەکان نیــە، بــەڵکو تەنها ئاماژە کردنێک بە ڕۆڵی بزووتنەوەی صەفەوی لە گۆڕانکاریی فیکــری سیاسی شیعەدا کە دەتوانــین بڵێــین ســەرهەڵدانی تەجروبــەی صەفــەوی لــە ئاکــامی ئــەو فەراغــە سیاســی‌یەوە بــوو کــە لــە ئــەنجامی وەک نظریــەی ئیمامەتو چاوەڕوانکردنی ئیمامی غائبەوە پەیدا بوو، چونکە کاتێک فیکر دوچاری‌بەاستەڵەک دەبــێو زانایــان توانــای نــوێ کردنــەوەیان نــابێو لەســەر ئەفکاری بەهەڵەدا چوو دەخەون، نظریەی چاوەڕوان کردنی ئیمــامی غــائب. ئەوا بێگومان کەسانێک پەیدا دەبن کە ئەو فیکرەیە ڕەفز دەکەن، خۆ ئەگەر ڕێگەیان لە فیکرەی چاکتو دروست نەکەوێت، ئەوا پەنا دەبەنــە بــەر بەرهــەم هێنــانی ئــەفکاری هەڵــەو توندتــرەو کــە لــە ئــەفکارە بــەردبووەکانی پێشــوو خەتەرناک تر دەبێت، ئەوە بوو ئایدۆلۆجیەتی صەفەویەکان زۆر خراپــتر بــوو لە نظریەی دوانزە ئیمامو چاوەڕوان کردنی ئیمامی غائب.

له گەرمەی کێشمەکێشمی نێوان ڕەوتە جیاوازەکانو لەنێوان واقیعو فیکردا، هەندێک لە پادشاکانی صەفەویو دواتر قاجاریەکانیش هەوڵیان ئەدا زانایانی شیعە بەلای خۆیاندا ڕابکێشن، بەو ئیعتبارەی کە نائیبی ئیمامی زەمانن، بەمەبەستی ئەوەی کە مۆڵەتیان لێ وەربگرنو بەناوی ئەوانەوە حکومەتداری بکەن، ئەوەبوو هەبوو لە زانایانی شیعە دەبوونە وەزیری پادشاکان.

لەگەڵ ئەوەشدا نظریەی ئیجازەدان بە پادشاکان یان هاوپەیمانێتی نێوان زانایانو پادشاکان نەیتوانی شەرعیەتی تەواو بدات بە سیستمی حوکم، چونکە هێشتا زانایانی شیعە پادشاکانو حوکمڕانەکانیان بە (غاصب) ئەدایە قەڵەمو حوکمکردنیان بە مافی تایبەتی ئیمامی غائب دەزانی.. ئەمە بوو بەهۆی چەند گۆڕانکاریەکی تر لە فیکری سیاسی شیعەدا بۆ چارەسەر کردنی گرێ کوێرەی (شەرعیەت) کە فیکری سیاسی شیعە لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا پێیەوە دوچار برو بوو.

## مەرجەعیەتی دینی

فیکری سیاسی شیعە لەسەدەی سیانزەهەمی کۆچیدا ئەمسەرو ئەوسەری دەکرد لەنێوان هەردوو نظریەی چاوەڕوان کردنو نیابەتی عامە. شیخ جعفر کاشف الغطاء لەساڵی (١٢٢٧)ی کۆچیدا ڕای وابوو کە فەقیهـ دەتوانێ ڕۆڵی نیابەتی گشتی لەبری ئیمامی مەهدی ببینێت لە بەجێهێنانی حدودو تەعزیرات لەسەردەمی غائب بوونی ئیمامداو واجبی کرد لەسەر شیعەکان کە پشتگیری لە فەقیهـ بکەنو بەشە خومسەکەی ئیمامی پێ بدەنو تەنانەت پێی باش بوو کە ماڵی زەکاتیش تەسلیمی فەقیهـ بکرێ. هەروەها ئیجازەی حوکم کردنی بە پادشای قاجاری (فتح علی)دا کە بەناوی ئەوەوە حوکم بکات بەو ئیعتبارەی کە نائبی ئیمامە، بەلام بەجێهێنانی نوێژی جومعەی قەدەغە کرد. بۆ مەسەلەی جیهاد مۆڵەتی ئیمام یان نائبە تایبەتەکەی بەمەرج دانا لەکاتی غەیبەتی ئیمامدا.

هەر بەم شێوەیە (شیخ محمد حسن النجفی) لەساڵی (١٢٦٦)دا نظریەی ئیمامەتی عامەی فراوان کرد، بەرادەیەک نزیکی کردەوە لە ئیمامەت، بەڵام مەسەلەی جیهادو دامەزراندی دەوڵەتی جیا کردەوە تا ئیمام دێتە دەرەوە، چونکە پشتی تەواوی بە فەلسەفەی غەیبەت بەستبوو و، ئیمانی بە حەتمیەتی دەرکەوتنی ئیمام هەبوو.

لەو کاتە بەدواوە زانایانی شیعە دێنو دەچن لەنێوان نظریەی چاوەڕوان کردنو نیابەتی گشتی داو هەر جۆرێک لە پێشەوایەتی سیاسی مومارەسە دەکەن کە ناودەنگی بە (مەرجەعیەتی ئاینی) دەرکرد کە ناگاتە ئاستی ئیمامەت.

## بزووتنەوەی ئەخباریەکان

دامەزراندنی دەوڵەتی صەفەویەکان لەسەدەی دەهەمی کۆچی‌داو ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر نظریەی نیابەی عامەدا هات، بوو بەهۆی سەرهەڵدانی تیۆرێکی سیاسی کە دەرکەی لەبەردەم زانایانی شیعەدا کردەوە بۆ ئەوەی ئیجازەی شەرعیەت بدەن بە پادشاکانی صەفەویو دواتر قاجاریو، بەوەکالەت لەلایەن نائبی ئیمامی مەهدیەوە حوکم بکەن.

ئەم تیۆرە نوێیە بوو بە هۆی پەرت بوونێکی قوڵو ترسناک لە کۆمەڵگەی شیعەی دوانزە ئیمامی‌دا کە بەکێشەی نێوان ئەخباریەکانو ئوصولیەکان دەناسرێت.

ئەم کێشەیە بەدەوری مەسەلەیەکی بچووکو جوزئی‌دا نەدەسوڕایەوە، بەڵکو پەیوەست بوو بە مەسەلەیەکی بنچینەییەوە کە تایبەت بوو بە پێناسی عەقائدی شیعەوە.. واتە لەڕاستیدا کێشەیەک بوو لەنێوان پارێزگارانو نوێ خوازاندا، بە دەربڕینێکی تر لەنێوان ئەوانەی قایم دەستیان گرتبوو بە نظریەی چاوەڕوان کردنی ئیمامەوە لەگەڵ ئەو ڕەوتەدا دەیویست خۆی لە چنگی مەرجە توندڕەویەکانی ئیمامەت قوتار بکات؛ وەک عیصمەتو دەقو چاوەڕوان کردن.

چونکە فیکری ئیمامی دوو کاری گرنگی تایبەت کردبوو بە ئیمامەوە:

**یەکەم**: تەشریعکردن بۆ مەسەلە نوێیەکان کە لە قورئانو سوننەتدا نین و، پەنا بردنە بەر ئیجتیهاد کردنیان ڕەت دەکردەوە، گوایە زانیارییەکی یەقینی نیەو نادروستە. زانیاری یەقینی تەنها ئیمامی مەعصوم لەلایەن خواوە دەست دەکەوێت.

**دووەم**: تەنفیذ کردنی شەریعەتو بەجێهێنانی ئەحکامی دینو سەرکردایەتی کردنی موسڵمانان لە ئەستۆی ئیمامدایە. هەر لەبەر ئەم بیروباوەڕە بوو کە بوونی ئیمامی دوانزەهەمیان فەرز کردو، وتیان ئەبێ چاوەڕوانی هاتنە دەرەوەی بکرێو کاری سیاسیو دامەزراندنی دەوڵەتیان حەرام کرد لەسەردەمی غائب بوونی ئیمامدا.

هەڵوێستی زانایانی شیعەی ئیمامی لە سەدەی سێیەمو چوارەمدا بەم جۆرە بوو.. لە قەرنی پێنجەمدا کاتێک هەندێ لە زانایان ویستیان دەرگای ئیجتیهاد بکەنەوە، ئەخباریەکان لێیان هاتنە زمانو ئەو بۆچوونە نوێیەیان بە دەرچوون لە ڕێبازی ئیمامەتو ڕوخاندنی پایەیەکی سەرەکی نظریەی ئیمامەت دەزانی.

لە ناوەڕاستی سەردەمی دەوڵەتی صەفەویەکاندا بزووتنەوەی ئەخباریەکان جارێکی تر سەری هەڵدایەوەو بانگەشەی کردەوە بۆ دەست گرتن بە ئەخبارو ڕەت کردنەوەی ئەو گۆڕانکاریانەی کە لە سایەی عەقڵو ئوصولدا ئەنجام دراوەو، پرۆسەی ئیجتیهاد کردنی ڕەفز کردووەو بەلادان لە دینی خوایان دایە قەڵەمو دانی نەدەنا بە هیچ جۆرە ویلایەتێک بۆ زانایان و، بە لادان لە ڕێبازی ئەهلی بەیت حساب کردن.. هەروەها تەقلیدیشیان ڕەت کردەوە جگە بۆ ئیمامی مەعصوم.

ئەم بزووتنەوەیە لە سەدەی سیانزەهەمدا تەشەنەی کرد کاتێ دەوڵەتی قاجاری دامەزرا لەسەرەتای قەرنی سیانزەهەمدا، دەوڵەتی شیعی لەنێوان زانایانی هەردوو مەدرەسەکەدا لەرە لەری دەکرد.

## گۆڕان بەرەو صۆفیگەری

کاتێک (محمدی کوڕی فتح‌علی) قاجاری دوای باوکی دەسەڵاتی گرتە دەست، لە زاناکانی هەردوو مەدرەسەکە خۆی بەدوور گرتو تەقلیدی هیچ لایەکیانی نەکرد، وەک باو بوو لەو سەردەمەدا.. لەبری ئەوە ڕووی کردە صۆفیەکان کە خۆیان بە نزیکتری ڕاستەقینەی شیعە دەزانیو پێیان وابوو پەیوەستن بە عیلمی خوایی ئیمامەکانەوەو بە گومانەوە دەیانڕوانی بۆ فەتوا جیاجیاکانی زانایانی شیعە.

لەبەر ئەوە (شاهـ محمدی قاجاری) حاجی میرزا ئاقای صۆفی کرد بە وەزیری خۆیو بە قوتبی شەریعەتو طەریقەتی دادەناو پێی وابوو کە پەیوەندی بەردەوامو ڕاستەوخۆی بەخواوە هەیەو بە مرۆڤێکی ئاسایی نەدەزانیو وەک مەرجەعێک سەیری دەکرد.

لەهەمان کاتیشدا پشتیوانی لە (محمد زین الدین الاحسائی) شێخی ئەخباریەکان دەکرد، چونکە قسەو بۆچوونەکانی ئەمیش نزیک بوو لە ڕاو بۆچوونی صۆفیەکانەوە.

## نظریەی ڕوکنی چوارەم

لە ئەنجامی لێک نزیک بوونەوەی صۆفیەکانو ئەخباریەکانەوە لەیەکتر، بزووتنەوەیەکی تازە پەیدا بوو کە (شێخ محمد کریم خان)ی قاجاری پێشەوایەتی دەکردو بانگەشەی کرد بۆ زەرورەتی بوونی ڕوکنی چوارەم، دوای سێ ڕوکنی (خواو پێغەمبەرو ئیمام) کە ئەویش شێخ محمد کریم خان خۆیەتی.

ئەم بزووتنەوەیە پێی وابوو لەگشت زەمانێکدا پێویستە شوێن کەسێک بکەون کە بەشیعەیەکی خالصو ئاوێنەی سیفەتەکانی ئیمام دەناسرێو ناسینی ئەو کەسە ڕوکنی چوارەمی ئیمامە.

## بزووتنەوەی بابیەکان

بزووتنەوەی ڕوکنی چوارەم گۆڕانی بەسەردا هاتو بزووتنەوەیەکی تری لێ پەیدا بوو بەناوی بزووتنەوەی بابیەکانەوە کە هاوڕێیەکی محمد کریم خانو یەکێ لە قوتابیەکانی (سید کاظم ڕەشتی) پێشەوایەتی کرد کە ئەویش (میرزا علی محمد شیرازی) بوو، ئەم پیاوە قسەی لەوە دەکرد کە گوایە نائبی ئیمامی مەهدییەو دەرگایە بۆ ئیمامی زەمانو پاشان زیاتر گەشەی کرد تا وای لێهات (میرزا علی محمد شیرازی) ئیدیعای ئەوەی دەکرد کە زیاتر لە هەزار ساڵە ئەو مەهدی منتظرە.

لەگەڵ ئەو ڕاو بۆچوونەی کە دەڵێ پەنجەی بیانی لەپشت ئەم بزووتنەوە خەتەرناکەوەیە، بەڵام یەکێکە لە دەرهاویشتەکانی ئەو بۆشاییە گەورەیە کە نظریەی ئیمامی غائبو سەردەمی غەیبەتی ئیمام دروستی کردبوو، ئەوەش مەسەلەی نەبوونی سەرکردایەتی سیاسیو هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی بەدیلێک بۆ ئەفسانەی ئیمامی چاوەڕوانکراو.

بۆی زانایانی شیعە هێرشێکی فراوانیان دژی بابو بزووتنەوەکەی بەرپاکردو داوایان کرد ئیعدام بکرێت، ئەوەبوو لە (٢٧/ شعبان/١٢٦٦)ی کۆچیدا لە تەبریز ئیعدام کراو، پاشماوەی ئەم بزووتنەوەیە لە ئێراندا هەر ماوەو بە بزووتنەوەی بەهائیەکان مەشهورەو لەلایەن کۆماری ئیسلامییەوە قەدەغە کراوەو سەرکوت دەکرێ.

## نظریەی ولایەتی فەقیه:

لەگەڵ هەرەس هێنانی دەوڵەتی صەفەویەکان لە سەدەی دوانزەهەمی کۆچیدا، بزووتنەوەی ئەخباریەکان سەرلەنوێ هاتەوە مەیدانو نظریەی چاوەڕوان کردنو حەرام کردنی ئیجتیهادو تەقلیدو قەدەغە کردنی نوێژی جومعە هەموو لایەکی گرتەوە.

بەڵام لە سەدەی سیانزەهەمدا نظریەی ئوصولی ئیجتیهادی دەستی کردەوە بە گەشە کردن و، لێرەو لەوێ زانایانی شیعە هەڵئەستان بە مومارەسەکردنی قەزاو فەتواو سەرپەرشتی کردنی کاروباری هەتیوانو شێتو

پەککەوتەکانو دابەش کردنی خومسو زەکاتو هەندێ کاروباری تری حکومەت.

ئەمەش مانای ئەوەبوو کە نظریەی (نیابەی عامە) لە بری ئیجازەدانی پاشاکان گۆڕا بۆ ئەوەی زانایان خۆیان ڕاستەوخۆ حوکمو کاروبار بەڕێوە بەرنو نظریەی چاوەڕوان کردن پشت گوێ بخەن بەتەواوەتی.

ئەم دیاردەیە بوو بەهۆی ئەوەی نظریەکە لە بەرگێکی نوێو گشتگیردا بخرێتە ڕوو لەژێر ناوی (ولایەتی فەقیهـ)دا.. ئەم نظریەیە هاوشانی ئیمامەتی گشتی گەورەیە بە مەرجەکانی عصمەتو دەقو بنەماڵەی حوسەینییەوە. (شێخ احمد محمد مەهدی الزاقی) کە لەساڵی (١٢٤٥)دا مردووە بەڕاشکاوی لەم بارەیەوە دەڵێ: (کل ما کان للنبي والامام فیه الولایة وکان لهم، فللفقیه ایضا..)عوائد الایام/ص١٨٨.

ئەم نظریەیە لە دوو بەش پێک دێت:

یەکەم: زەرووڕەتی ئیمامەت لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا.

دووەم: یەکلا کردنەوەی ئیمامەت بۆ فەقیهەکان.

کەواتە نظریەی ولایەتی فەقیهـ گۆڕانێکی ڕیشەیی بوو لە فیکری سیاسی شیعەدا بەرەو خۆ دەرباز کردن لە نظریەی (ئیمامەتی الهی)و زەرووڕەتی ئیمامەتو قیادەی گشتی لەسەردەمی غەیبەتی ئیمامدا کە بۆشاییەکی گەورەی دروست کردبوو لە ژیانی سیاسی شیعەکاندا.

## بزووتنەوەی دیموکراتی دەستووری

لەکاتێکدا زانایانی شیعە سەرگەرمی توێژینەوەو تاوتوێ کردنی (نظریەی ولایەتی فەقیهـ) بوون، پاشاکانی قاجاری لە ئێران خەریکی مەحکەم کردنو فراوان کردنی دەسەڵاتی بێ سنووری خۆیان بوون. ناصرالدین شاه کە لەنێوان ساڵەکانی (١٨٤٨-١٨٩٦) بۆ ماوەی (٥٠) ساڵ حوکمی ئێرانی کرد.. ئەوەبوو بەبێ هیچ پرسو ڕایەکی گەل یان زانایان ڕێکەوتن نامەی کڕینو فرۆشتنی تووتنی لەگەڵ شەریکەیەکی بەریتانیادا مۆر کردو،

بەبێ ئەوەی گوێ بداتە نارەزایی میللەت بەرامبەر ئەو ڕێکەوتننامەیەی کە (٢٠٪)ی ئابووری ئێرانی خستبووە ژێر ڕکێفی بەریتانیاوە.

بۆیە خەڵکی ئێران پەنایان بردە لای (میرزا محمد حەسەن شیرازی) کە مەرجەعی شیعەکانە بوو لە سامەڕا دادەنیشت لە عیراق. ئەویش زۆر بوێرانە فەتوای حەرام کردنی جگەرە کێشانو بەکارهێنانی توتنی دەرکرد بە هەرشێوەیەک بێت.. زەراعەت کردنیو فرۆشتنو کڕینو جگەرەکێشانیو ڕایگەیاندن کە هەرکەسێک سەرپێچی ئەم فەتوایە بکات ئەوا دژایەتی ئیمامی زەمان دەکات. ئەمە لە (١٣٠٩ھـ/١٨٩١ز)بوو.

ئەم فەتوایە کاریگەرییەکی گەورەی هەبوو لەسەر خەڵکی ئێران کە زۆر بە وردی پێڕەویان لێ کرد، تەنانەت هاوسەری شاو هەڵسوڕێنەرانی کۆشکی مەلەکی پابەندی ئەو فەتوایە بوون، بۆیە ناصرالدین شا ناچار بوو مل کەچ بکاتو ڕێکەوتننامەکەی ڕەت کردەوەو زانایانی دەعوەت کرد بۆ تارانو پەیمانی پێدان کە لە ئایندەدا بۆ هەموو کاروبارێک ڕاوێژیان پێ بکات.

بەهەرحاڵ ئەم ڕووبەڕوو بوونەوە لەنێوان ناصرالدین لەلایەکو زانایانو خەڵکی ئێران لەلایەکی ترەوە، مەلەفی شەرعی پادشا دکتاتۆرەکانی ئێرانی کردەوەو بوو بەهۆی بەرپا بوونی بزووتنەوەیەکی ئیصلاحیی بەردەوام لەپێناو چاککردنی سیستمی سیاسی لە ئێرانداو دامەزراندنی دیموکراتیەتو دیاری کردنی دەسەلاتەکانی شا بەپێی ئەنجومەنێکی شوراو پەرلەمان کە لەلایەن میللەتەوە بە هەڵبژاردن دیاری بکرێ، هەروەها داوایان لە شا کرد کە حکومەتەکەی دەستووری بێتو پابەند بێت بە پەرلەمانەوە.

دوای خەباتێکی درێژخایەن ئەم بزووتنەوەیە توانی سەرکەوتن بەدەست بهێنێتو یەکەم پەرلەمانی دەستووری لە ئێراندا لەساڵی (١٩٠٦ز) دروست بکات.. بەشێوەیەک دەستوور شاو مەرجەعیەتی دینیو میللەت پێکەوە کۆبکاتەوە.

دەگونجێ هۆی پەنابردنی زانایانی شیعە لە ئێراندا بۆ ئەم (الصیغة التوفیقیة) شێوە مامناوەندییە لەنێوان زانایانو پادشاکانیاندا بگەڕێتەوە

بۆ هەست کردنیان بە کەم دەسەڵاتیان بۆ ڕووخاندنی سیستمی مەلـەکی یـان بۆ ئەوەی هێشتا (نظریـــەی ویلایـەتی فەقیهـ) لـەلایان گەلاڵـە نـەبوو بـوو بەشێوەیەک کە زانایان ڕاستەوخۆ خۆیان حوکمڕانی بگرنە دەست.

لەم ئەزموونە دیموکراتیەدا ئەوە دیارە کە زانایان ڕۆڵێکی گەورەیان بە میللـەت داوە لـەبواری یاســادانانـدا لــەڕێگای ئەنجومـــەنی شـــوراوەو مەسەلەکەیان تایبەت نەکردوە بە زانایـــان خۆیانـەوە.. هەرچـەندە جـەختیان لەسەر ئەوە کردوە کە زانایان یان دەستەیەک لە زانایان کاریـان بریتـی بێـت لە پارێزگاری شەرعیەتی ئەو یاسایانەی کە پەرلەمان دەریان دەکات.

شایانی باسە لێرەدا کە دەستووری ساڵی (١٩٠٦ز) بـوو بـە ئەساسـی دەستووری جمهوری ئیســلامی کـە لەســاڵی (١٩٧٩)دا دامــەزرا، تـەنها ئەوەندەیە کە لە بری شا سەرەک کۆمـار دانـراوەو دەسـەڵاتو ڕۆڵێکـی زۆر زیاتری داوە بە (وەلی فەقیهـ).. دەتوانـین بڵێـین دەسـەڵاتی موتڵـەقو بـێ سـنوور بـەپێی نظریـەی ولایـەتی فەقیهـ کـە لەمـەو دوا ئیمـام خومـەینی گۆڕانکاری گەورەی تێدا کرد.

# بەشی پێنجەم

## کۆماری ئیسلامی ئێران و ویلایەتی فەقیهی موتڵەق

حوکمی مەلەکی دەستووری زۆری نەخایاند، چونکە جەنگی جیهانی یەکەم هەڵگیرساو هێزەکانی ڕوسیا بەشێکی فراوانی وڵاتی ئێرانیان داگیر کردو زەمینە خۆش بوو بۆ ڕەزا شای پەهلەوی کە (احمد شای قاجاری) بەرکەنار بکاتو خۆی بکاتە شا بەسەر ئێرانەوە بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە ئیزنێک لە زانایانو مەراجعی شیعە وەربگرێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە هێرشێکی توندو تیژی بەرپاکرد لە دژی داوو دەزگای مەزهەبی، دوای خۆی (محمد ڕەزا)ی کوڕی درێژەی دا بەهەمان سیاسەتو بەردەوام بوو لە کەم کردنەوەی ڕۆڵی پیاوانی ئایینی لە دەستێوەردانی کاروباری حکومەت.

لەساڵی (١٩٦٣)دا ئیمام خومەینی سەرکردایەتی ڕاپەڕینێکی کرد لە دژی (محمد ڕەزاشای پەهلەوی)و لە ئاکامدا دوور خرایەوە بۆ عیراق. لەوێوە بەردەوام بوو لە پێشکەش کردنی وانەو موحازەراتو بەرهەم هێنانی نظریەی نوێ لە کۆی هەردوو نظریەی (نیابەی عامە)و (ولایەتی فەقیهـ)و توانی فیکری سیاسی شیعە لە قۆناغی ئیجازە پێدانی پاشاکان لەلایەن زانایانەوە بۆ ئەوەی بەناوی ئەوانەوە حوکم بکەن، بۆ قۆناغێکی نوێ کە بریتی یە لە حوکم کردنی ڕاستەوخۆی زانایانو مومارەسە کردنی ئیمامەت بەشێوەیەکی فراوان.

ئەو بیرو بۆچوونانەی کە خومەینی پێشکەشی دەکردو دابەش دەکرا بەسەر لایەنگرانی لەڕێگای ناوەندە مەزهەبییەکانی شیعەوە لە ئێران، بنکەیەکی جەماوەری دروست کردو شۆڕشی ئیسلامیی ئێرانی لەسەر بەرپا کرا، کە بوو بەهۆی ڕوخاندنی ڕژێمی شاهەنشاهی بنەماڵەی پەهلەوی و دامەزراندنی جمهوری ئیسلامیی ئێرانی لە ساڵی (١٩٧٩)ز. بۆیە لێرەدا بەپێویستی دەزانین کە گرنگترین بیرو بۆچوونەکانی ئەم نظریە نوێیە کە گشت نظریە سیاسییەکانی پێش خۆی وەلا ناوە بخەینە ڕوو:

## هەڵوێست لە نظریەی چاوەڕوان کردن

خومەینی نظریەی چاوەڕوان کردنی ئیمامی مەهدی کە بۆ چەندین سەدە فیکری سیاسی شیعە لەسەری ڕاوەستا بوو، بەتەواوەتی ڕەت کردەوەو لە کتێبەکەیدا بەناوی (حکومەتی ئیسلامی) نووسیویەتی دەڵێ: بە بەڵگەکانی شەرعو عەقڵ ثابت بووە کە ئەوەی زەرووری بووە لەسەردەمی پێغەمبەرو ئیمامی عەلیدا لە بوونی حکومەت تا ئەمڕۆش زەروورییە.

پرسیار دەکاتو دەڵێت: زیاتر لە هەزار ساڵ بەسەر غائب بوونی ئیمامی مەهدیدا تێپەڕ بووەو ڕەنگە بەهەزاران ساڵی تریش بڕوات پێش ئەوەی ئیمامی زەمان بێتە دەرەوە، ئایا ڕەوایە کە ئەحکامی ئیسلام پەکێ بخرێتو خەڵکی بە مەیلی خۆیان هەرچی ئەکەن بیکەن؟! ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە ئیسلام نەسخ کرابێتەوە!!

کەواتە هەروەکێ چۆن ئیمامەت زەروورییە بە هەمان بەڵگە حکومەتیش زەروورییە لەسەردەمی غائب بوونی ئیمامدا، کە خوا پەنا بدات ڕەنگە تا هەزاران ساڵی تریش هەر غائب بێت!! (لەوە دەچێ ئیمام خومەینی باوەڕی بە ئیمام زەمان نەبێت تەنها بۆ چەواشە کردنی جەماوەری شیعەی خێرنەدیو نەبێت).

## فەقیهەکان دەبێ فەرمانڕەوا بن

خومەینی دوای ئەوەی ئەوە دەسەلمێنێ کە ئیمامەت لەسەردەمی غەیبەتدا زەرووریەو نابێ ڕابوەستێنرێو چاوەڕوانی دەرکەوتنی ئیمام بکرێ، دەڵێت: (... ئەمڕۆ لەسەردەمی غەیبەتدا دەقێک نیە لەسەر کەسێکی دیاریکراو بۆ ئەوەی کاروباری دەوڵەت بەڕێوە بەرێت، ئەی چارە چییە؟ ئایا ئەحکامی ئیسلام پەکێ بخرێت؟!)

پاشان زیاتر مەسەلەکە ڕوون دەکاتەوە کە لەگەڵ ئەوەشدا دەقێک نیە لەسەر کەسێکی دیاریکراو بۆ ئەوەی جێگری ئیمام بێت لەکاتی غائب بوونیدا، بەڵام تایبەتمەندیەکانی حاکمی شەرعی دەکرێ لە هەندێ کەساندا

وەها بێت کە بتوانێ حوکمڕانی بکات.. ئـەو تایبەتمەندیانـەش بریتیـیـە لـە شارەزاییەکی باش لە قانوونو سیفەی عەدالەت لە زانایانی ئەم ســەردەمەدا هەیە. کەواتە زانایانِ متمانەپێکراوی پێغەمبەرانو قەڵای شەریعەتن، لەبــەر ئەو تایبەتمەندیانە ولایەتی فەقیهـ بریتییە لە ولایەتێکی موتڵەق.

هەروەها ئیمام خومەینی دەربـارەی لەیـەک چـوون لـەنێوان (فەقیهــ)و (ئیمامی مەعصوم)دا دەڵێت: فەقیهـ هەر وەکو پێغەمبەرو ئیمامەکان هەر شتێک بۆ ئەوان ڕەوابێت بۆ ئەمیش ڕەوایە، چونکـە فەقیهـەکان جێگـەداری پێغەمبـەرن دوای ئیمامـەکانو لـەکاتی غــائب بوونیــاندا گشــت ئــەرکو دەسەڵاتەکانی ئیمامیان هەیە.

هـەروەها دەڵێـت: لەبـەر ئـەوەی (الفقهـاء ورثـة الانبيـاء) بۆیـە هـەر شـتێکی پێغەمبـەران بگوێزرێتـەوە، ئـەوا دەگوێزرێتـەوە بـۆ زانایـان، هیـچ گومان لــەوەدا نیـە کـە مەسـەلەی ولایـەتو دەسـەڵاتی گشـتییە، ئـەوەش دەگوێزرێتەوە بۆیانو هەموو زانایان لەو مەسەلەیەدا یەکسانن.

## ولایەتی خوایی (الولاية الالهية)

لە ئەنجامی ئەو بۆچوونانەدا ئیمام خومــەینی پێـی وایـە کـە ولایـەتی فەقیهــ ولایـەتێکی دینـی خوایـیەو لەسـەردەمی غـائب بوونــی ئیمــامدا دامەزراندنی دەوڵەت تەنها مــافی زانایانـەو لـە پێغەمبـەرو ئیمامەکانـەوە بۆیان گوێزراوەتەوەو دەڵێت: (وعلى ذلك يكون الفقيه في عصر الغيبة وليـا للامر ولجميع ما كان الامام وليا له وان للفقيه جميع ما للامام..)

## کێشەی کێبەرکێ لەنێوان فەقیهەکاندا

لەسەر ئەساسی نظریەی (الجعل والنصب الالهي) بۆ دانانی زانایان بـە فەرمانڕەوای خەڵکی لەلایەن ئیمامەکانەوەو یەکسانی زانایان بۆ هەڵسان بـە ئەرکو دەسەڵاتی ولایەت، لەبەر ئەوەی دەگونجێ کێشـەی مونافەسـەو کێ بەرکێ لەنێوان (زانایان - الفقهاء)دا پەیدا ببێت، ئیمام خومەینی پێی وایە کە مونافەسەو پێش پێشێن حەرامەو دروست نیە، چونکە پێشـکەوتنی هـەر

زانایەک (فەقیهێک) لەو بوارەدا ئەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی مافی فەقیهەکانی ترو بۆیان نیە دەستێوەردانی ئەرکو دەسەڵاتەکانی بکەن.

## کۆماری ئیسلامیی ئێرانی

بێگومان ئیمام خومەینی (١٠)سال دوای دارشتنی ولایەتی فەقیهـ بەم شێوەیەی ئێستای سەرکەوتنی بەدەست هێناو لە ساڵی (١٩٧٩)دا دەسەڵاتی گرتە دەستو جمهوری ئیسلامیی ئێرانی لەسەر بنچینەی ئەم نظریەیە دامەزراند. هەرچەند لەسەرەتاوە شێوازێکی دەستووریی تێرو تەسەلی دەربارەی حکومەت لا ڕۆشن نەبوو. بۆیە ئەرکی ئامادەکردنی پرۆژەی دەستووری سپارد بە هەیئەتێک لە زانایانو شارەزایان (مجلس الخبراء)کە بە هەڵبژاردن دیاری کرابوون.

ئەو ئەنجومەنە هەڵسا بە دانانی دەستوورێکی نوێ لەسەر بنچینەی نظریەی ولایەتی فەقیهو وەک دەستووری ساڵی (١٩٠٦) تەنها ئەوەندە نەبێ کە شا گۆڕا بۆ سەرەک کۆمار، کە بە هەڵبژاردن لەلایەن گەلەوە دیاری دەکرێتو هەروەها مەقامی ئیمام (وەلی فەقیهـ) کە مەرجەعی باڵایەو بەرزترین دەسەڵاتی دەستوورییە.لە وڵاتداو تەزکیەو موافەقەتی ئیمامی بەپێویست داناوە لە دیاری کردنی سەرەک کۆماری جمهووریدا، بەبێ ئەوە شەرعیەتی نابێو ناتوانێ مومارەسەی ئەرکو دەسەڵاتەکانی بکات.

جگە لەوانەش ئەنجومەنێکی شورای هەڵبژێردراو لەلایەن میللەتەوەو سەرەک وەزیرانێک کە لەلایەن سەرەک کۆمارەوە دیاری بکرێتو لەلایەن ئەنجومەنی شوراوە پشتگیری لێ بکرێت.. هەروەها ئەنجومەنێکی تری بچکۆلە بەناوی (مجلس للحافظة علی الدستور) بۆ چاودێری کردنی یاساکانو گونجانی لەگەڵ ئیسلامو دەستووردا.. ئەو دەستوورەی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی تەنفیذیو تەشریعی نەداوە بە ئیمامی مرشد (ڕابەر) جگە لە دیاری کردنی قازیەکانو قیاداتی سوپاو هێزە چەکدارەکان. هەروەها حکومەت بە سەرەک کۆمارو سەرەک وەزیرانیەوە لە دەرەوەی دەسەڵاتی

ئیمامدا بوون و عەمەلیەی تەشریعی تایبەت بوو بە ئەنجومەنی شوراو دوور بوو لە دەسەڵاتی ئیمامەوە.

ئەنجومەنی شارەزایانی یەکەم (مجلس الخبراء التأسیسي) لە یەکێ لە قۆناغەکانی لێکۆڵینەوەو دەنگداندا خەریک بوو مەقامی سەرکردایەتی باڵای هێزە چەکدارەکان لە ئیمام وەربگرنەوەو بیدەن بە سەرەک کۆمار، هەرچەند خەتی ولایەتی فەقیهـ لە ئەنجومەنی شارەزایاندا توانیان دەسەڵاتەکانی ئیمام بەهێزتر بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا لە بواری سیادەو قیادەدا کە مەحدود بوو و، دوور بوو لە بواری تەنفیذیو تەشریعی بەپێی دەستوور.

## ولایەتی فەقیهی موتڵەق (الولایة المطلقة)

دوای تێپەڕبوونی دە ساڵ بەسەر تەجروبەی جمهوری ئیسلامیدا لە ئێران کێشەیەکی تەشریعی سیاسی فیکری بەرپابوو، کاتێک ئەنجوومەنی پارێزگاری کردن لە دەستوور (مجلس للحافظة علی الدستور) پرۆژەی یاسای کاری ڕەت کردەوە کە لەلایەن ئەنجوومەنی شوراوە ئامادە کرابوو، بەبیانووی ئەوەی پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلامە .. لە ئەنجامی ئەوەدا وەزیری کار ناچار بوو هانا بۆ ئیمام خومەینی ببات کە باڵاترین دەسەڵاتە بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکە. ئیمام خومەینی ئیجازەی بە وەزیری کار دا کە یاساکە جێبەجێ بکات، بەبێ ئەوەی بە ئیجرائاتی دەستووری نیهائیدا بڕوات؛ کە پێویستی بە دەنگدان هەیە لەلایەن ئەنجومەنی پاراستنی دەستوورەوە.

وەزیری کار سودی لە مۆڵەت پێدانی ئیمام خومەینی وەرگرتو هەوڵی فراوانکردنی دەسەڵاتی خۆی دا بە بەجێهێنانی چەند یاسایەکی تر کە هێشتا ئیجرائاتی یاسایی پێویستیان تەواو نەکردبوو.

ئەم ڕەفتارە (سەید عەلی خامەنەئی) نیگەران کرد، کە ئەو کاتە سەرەک کۆمار بوو، ئەوەبوو لە نوێژی جومعەی شاری تاران لە

(١٠/جمادی یەکەم/١٤٠٨ك - ١٩٨٨ز)دا وتارێکی داو ڕەفتاری وەزیری کاری مەحکوم کرد.

لە ئاکامی ئەوەدا ئیمام خومەینی تووڕە بووو ناڕەزایی دەربڕی بەرامبەر وتارەکەی (علی خامنئی)و پەیامێکی توندو تیژی ئاراستە کرد کە تیایدا ئیمانی بە (ولایەتی موتڵەقی بێ سنووری فەقیهـ)ی ڕاگەیاندو دەڵێت:

[لە قسەکانی نوێژی جومعەتاندا ئەوە دەردەکەوێت کە ئیمانتان بەو شێوەیە نیەکە حکومەت ولایەتێکی سپێردراوە لەلایەن خواوە بۆ پێغەمبەرو لەپێش گشت ئەحکامە فەرعیەکانی خواوەیە(واتە ئەحکامە شەرعیەکان) نموونە هێنانەوەتان بەو قسەیە کە (دەسەڵاتی حکومەت لە چوارچێوەی ئەحکامی فەرعی خوایی دایە) پێچەوانەی قسەی منە. ئەگەر بێتو دەسەڵاتی حکومەت لەچوارچێوەی ئەحکامی فەرعی خوایی دابێت، ئەوا مانای ئەوەیە کە پێویستە (اطروحەی حکومەتی الهی) ئیلغا بکرێتەوەو ولایەتی موتڵەقی سپێردراو بە پێغەمبەری ئیسلام هیچ مانایەکی نامێنێ.

بۆیە دەبێ ڕۆشنی بکەمەوە کە: حکومەتداری بەشێکە لە ولایەتی موتڵەقی[1] پێغەمبەرو یەکێکە لە ئەحکامە سەرەتاییەکانی ئیسلامو لەپێش گشت ئەحکامە فەرعیەکانەوەیە، وەک نوێژو ڕۆژو و حەج.

حاکم یان حکومەت بۆی هەیە لەکاتی پێویست دا مزگەوتەکان دابخات یان بیانڕوخێنێت کاتێک وەک مزگەوتی (ضرار)ی لێبێتو جگە لە ڕووخاندن چارەیەکی تری نەبێت.

---

[1] شایانی باسە بەپێی مەزهەبی ئەهلی سوننەتو جەماعەتو بەڵگەکانی قورئانو سوننەت؛ ولایەتی پێغەمبەر ﷺ لەسنووری ئەو شتانەدایە کە (وحی)یان لەبارەوە بۆ دێت لەلایەن خواوە ، بۆ نموونە ڕووداوەکەی بەدرو هەڵوێستی حەبابی کوڕی منذر :(لهذا منزل انزلکه ا لله...).

وە حکومەت دەتوانێت یەک لایەنە ئەو ڕێکەوتننامە شەرعیانە هەڵبوەشێنێتەوە کە لەگەڵ میللەتدا لەسەری ڕێک کەوتووە، ئەگەر بینی پێچەوانەی بەرژەوەندیەکانی ئیسلامو وڵاتە. وە دەتوانێت بوەستێ لەبەردەم هەر مەسەلەیەکی عیبادەتی یان غەیری عیبادەتی ئەگەر زیان بە بەرژەوەندیەکانی ئیسلام بگەیەنێت.

هەروەها حکومەت دەتوانێت لەکاتی هەلومەرجی نەگونجاو لەگەڵ بەرژەوەندیەکانی وڵاتی موسڵماندا بەشێوەیەکی کاتی حەج کردنی ماڵی خوا ڕابگرێت کە یەکێکە لە فەریضە گرنگەکانی ئیسلام.

ئەوەی ئێستا وتراوە یان دەوترێ زادەی بێ ئاگاییە لە ولایەتی موتڵەقی خوایی.

وە ئەو قسەو باسەی کراوە دەربارەی ڕاگرتنی هەندێ مەسەلەی بواری زەراعەت لەلایەن دەسەڵاتی حکومەتی نوێوە (مەبەستی ئەو صلاحیاتەیە کە خومەینی داویەتی بە وەزیری کار)، بەڕاشکاوی دەڵێم: ڕاستە ئەوە لە صلاحیاتی حکومەتەو زۆر مەسەلەی تریش هەیە کە نامەوێ لەوە زیاتر نیگەرانتان بکەم].

ئەمە دەقی پەیامەکەی ئیمام خومەینیە کە لە ڕۆژنامەی (کەیهان)ی فارسیەوە وەرگیراوە ژمارە/١٣٢٢٣ بەرواری (١٦/جمادی یەکەم/١٤٠٨ک-١٩٨٨ز)

ئەم نامەیەی ئیمام خومەینی گۆڕانکاریەکی گەورە بوو لە نظریەی ولایەتی فەقیهدا بەرەو ڕەهاییو گشتگیریو بازدانێکی مەزن بوو لە فراوان کردنو ڕەها کردنی ولایەتداو باس لە دەسەڵاتێکی چوون یەک دەکات لە دەسەڵاتی پێغەمبەری مەزنو ئیمامە مەعصومەکان بۆ وەلی فەقیهو بگرە زۆر زیاتریش.

لەم نظریەیەدا خومەینی هەردوو نظریەی ولایەتی عامەو ولایەتی فەقیهی پێکەوە کۆ کردوەتەوەو گۆڕینێکی ئەوتۆی تێدا کردوون کە ببێتە یەک نظریەی موتڵەق.

## دکتاتۆریەتی دینی

نظریەی ولایەتی موتڵەق بەم شێوەیە کـە دەسـەڵاتی فـراوانو موتڵەق ئەدات بە وەلی فەقیهـ بەسـەر خـەڵکو مولّکوماڵیانـدا، لـەکاتێکدا کـە مەعصوم نیەو دووچاری هەڵەو لادانو گوناهـو لەبیرچوون دەبێت . بەوەشەوە ناوەستێ بەڵکو دەسەڵاتی ڕاوەستاندنی یاسا شەرعیەکان ئەدات بە فەقیهـ.. ئـەم نظریەیـە هەوڵدانێکـە بـۆ هـەڵگرتنی جیاوازیـە زەروریـەکانی نێـوان پێغەمبەری مەعصومو پەیوەست بە ئاسمانـەوە کە وەك خـوا دەفـەرموێ : ﴿وما ینطق عن الهوی ان هو الا وحـي یوحـی﴾ لەگـەڵ مرۆڤێکـی ئاسـایی فەقیهدا کە وەك وتمان پارێزراو نابێ لە نەزانینو لادانو حەزو ئارەزوو.

ئەم بۆچوونە سەرسوڕهێنەرە نەك هەر دژایـەتی گـەورەی هەیـە لەگـەڵ بەڵگە عەقڵی نەقڵیەکانی قورئانو سوننەتدا، بەڵکو دژایەتیشی هەیە لەگـەڵ فیکری شـیعەی ئیمـامی خۆیـاندا، کـە قـەبوڵیان نـەبووە فەرمانبـەرداریو فەرمانڕەوایانی موسڵمان بکەن، بەبیانوی ئەوەوە کە دەترسن فـەرمان بـدەن بە گوناهـ (المعصیة). ئەوانیش بکەونە گێژاوی دژایەتی لـەنێوان گوێڕایـەڵی کردنی فەرمانەکانی خواو فەرمانەکانی فەرمانڕەوای کاربەدەستدا.

هەر لەم ڕوانگەیەوە بوو کە فیکری ئیمـامی نظریـەی عصمـەتو دەقو یەکلابوونەوەی ئیمامەتیان لە بنەماڵەی ئیمامی عەلیو حوسەینی کورپـدا کردە مەرجی ئیمامەکان تا ڕۆژی قیامەت.

ئەگەر فەقیهی فەرمانڕەوا ئەم هەموو دەسەڵاتە ڕەهاو فراوانەی بدرێتێ کە زیاترە لە دەسەڵاتەکانی پێغەمبەری مەزن ﷺ مانای ئەوەیە کە واجبـە لەسـەر خـەڵکی فەرمانبـەرداریی بکـەنو بـەهیچ شێوەیەك بۆیـان نیـە لـە فەرمانی دەربچن، ئەگینا لەرووی دینیەوە گوناهبارو تاوانبار دەبـن.. ئەمـە

لەکاتێکدا فەقیهـ کەس ناتوانێ لاری لەوە بکات کە پارێزراو نابێ لە گوناهو هەڵەو گشت لاوازیەکی بەشەریی ئاسایی.

ئەگەر مەسەلەکە وای لێهات، ئەبێ بۆچی لەسەرەتاوە عصمەتو دەقو بنەماڵەی ئیمام عەلیو حوسەینیان کردە مەرجی ئیمامەتو پێچەوانەی جمهوری موسڵمانان بوونو هەڵبژاردنی حەزرەتی ئەبوبەکریان لەلایەن سەرجەم موهاجرینو ئەنصارەوە ڕەت کردەوە؟! لەکاتێکدا هیچ کەسێک گومانی لەوەدا نیە کە ابوبکر لە گشت زانایانی ئەم سەردەمە زاناترو لەخواترس تر بووە.

مادام فەقیهـ مرۆڤێکی ئاساییەو مەعصوم نیە، کەواتە وەک هەموو مرۆڤێکی تر دوچاری حەزو ئارەزووی دەسەڵاتو حەسەدو غروررو لادان دەبێ. بگرە لە هەموو مرۆڤێکی تر زیاتر مەترسی لێ دەکرێ لەو بوارانەداو دەگۆڕێت بۆ خەتەرناکترین دکتاتۆر کە دینو داراییو هێز لەدەست دەگرێو ئەبێتە سێبەری خوا لەسەر زەویو فەرمانڕەوایەکی ڕەها دەسەپێنێ بەسەر میللەتدا، هەروەک پاپاکان لە سەدەکانی ناوەڕاست کردیان.

ئائەم حاڵەتە ناهەموارە ڕووی کردە کۆماری ئیسلامیی ئێران، کاتێک ئیمام خومەینی ئەو نامە خەتەرناکەی ئاراستەی سەید عەلی خامەنەئی کردو ئەویش چاوی لەڕاستی نوقاندو تەسلیمی ئەمری واقع بوو.. ئەو نامەیەی کە دەسەڵاتێکی ڕەهاو فراوانی وەها ئەدا بە وەلی فەقیهـو حکومەتەکەی کە دەتوانێ یەک لایەنە هەرچی ڕێکەوتنننامەی شەرعی هەیە لەگەڵ میللەتدا هەڵبوەشێنێتەوە، بەبێ ئەوەی مشاوەرەو پرسو ڕا بەهیچ دەزگایەکی شەرعیو دەستووری بکات ! هەرکاتێک ببینێت کە مەصلەحەتی ئیسلامو موسڵمانان ئەوە دەخوازێت.

لاری لەوەدا نیە کە لەکاتی مەصلەحەتو زەروورەتدا زۆر شت دەکرێ، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کێ وە چ دەزگایەک ئەو مەصلەحەتو زەروورەتە دیاری دەکات ؟! چونکە ئیمام خومەینیو لایەنگرانی نظریەی ولایەتی

فەقیهـ مافی دیاری کردنی مەصلەحەتو زەروورەت ئەدەن بە فەقیهی حاکم نەک بە میللەتو داموو دەزگا شەرعیو دەستووریەکان.

ئەم حاڵەتە ترسناکە لە ئێراندا ڕووی دا ، کاتێک ئیمام خومەینی بە عەمەلی دەستووری جمهوری ئیسلامیی ئێرانی تەجمید کردو سنووری دەسەڵاتە دەستوریە دیاری کراوەکانی خۆی بەزاندو بڕیارەکانی ئەنجومەنی شوراو ئەنجومەنی پاراستنی دەستورو سەرۆک کۆمارو سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی هەڵوەشاندەوە بەبیانووی ئەوەی کە ناگونجێن لەگەڵ مەصلەحەتی ئوممەتو ئیسلامدا.

ڕیشەی ئەم کێشەیە لەوەدایە کە خومەینیو لایەنگرانی نظریەکەی پێیان وایە کە وەلی فەقیهـ شەرعیەتی حوکم کردنی لە ئوممەتەوە وەرنەگرتووە، بەڵکو لەلایەن پێغەمبەرو ﷺ ئیمامی مەهدیو ئیمامەکانی پێشووەوە بۆی ماوەتەوە حەقێکی ئیلاهیىیە.. کەواتە پێویستی بە وەرگرتنی ڕەزامەندی میللەت نیە لە هیچ مەسەلەیەکداو مافی ئەوەی هەیە کە بەگوێرەی ئیجتهادو بۆچوونی خۆی فەرمان دەربکاتو لەسەر ئوممەت واجبە کە بەگوێی بکەن بەبێ سەرلێکردنەوەو مناقەشە کردن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە فەقیهـ دەسەڵاتی فراوانو ڕەهای هەیە کە ڕێگا بەخۆی بدات هێز یان کودەتای سەربازی بەکار بهێنێ بۆ ئەوەی دەسەڵات بگرێتە دەست، یان یەکلای بکاتەوە بۆ خۆیو مافو ئازادیە گشتییەکان هەڵبگرێتو حزبەکان قەدەغە بکاتو ئەنجومەنی شوراو دەزگاکانی تری دەوڵەت هەڵوەشێنێتەوەو یاسای نوێ دەربکات پێچەوانەی شەریعەتو دەستوور بێت. وەک چۆن خومەینی یاسای (دادگا تایبەتەکانی پیاوانی ئایینی) دەرکردو ئێستاش کاری پێ دەکرێت، لەکاتێکدا بە پێچەوانەی شەریعەتو گشت یاسایەکی دنیاییەوە هەرچۆنێکیان بوێت حوکم دەردەکەن.

بەپێی نظریە مرتڵەقەکەی ولایەتی فەقیهی ئیمام خومەینی بەسەر میللەتانی ئێراندا سەپاندوویەتی، دەسەڵاتو صەلاحیاتی فەقیهـ لە ئیمامی مەعصومو پێغەمبەری مەزن ﷺ زیاترەو لەلایەن ئیمامی مەهدیەوە

دانراوەو نائیبەتی. بەم شێوەیە مەقامێکی پیرۆزو موقەددەسی دراوەتێو ئوممەت مافی معارضەو ڕەخنەو سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی فەقیهی نیە. چونکە بۆچوونو ئیجتیهادەکانی فەقیه صبغەیەکی دینیو موقەددەسیان هەیەو واجبە لەسەر ئوممەت کە فەرمانبەرداریی بکات لە بواری تەشریعو تەنفیذو قەزاداو ئەمەش مانای ئەوەیە کە ڕۆڵی سیاسی میللەت هەڵگیراوە لە مومارەسە کردنی شوراو ڕەخنەو معارضە کردنو چاودێری کردنو لابردنی فەقیه یان کەم کردنەوەی دەسەڵاتەکانی یان دیاری کردنی ماوەی ڕابەریتی.

لە کۆتاییدا دەڵێین: فیکری سیاسی شیعە ناتوانێ لەم تەنگژە یەک لەدوای یەکانە ڕزگاری ببێتو بەرەو پێش بڕواتو بنەماکانی سیستمی سیاسی شوراو دادپەروەری جێگیر بکات، تا خۆی لە ئەفسانەو خەیاڵاتە هەڵبەستراوە دەرباز نەکات کە خراوەتە ناو کەلەپورو فیکری ئەهلی بەیت.. وەک دانراوەکانی ( عصمەتو دەقو ئیمامەت لە بنەماڵەی عەلیو حوسەین)داو، لەسەروو هەموویانەوە ئەفسانەی لەدایک بوونی ئیمامی دوانزەهەم (محمد کوڕی حەسەنی عەسکەری) کە هەرگیز هیچ کەسێک لە ئەهلی بەیت باسیان لێوە نەکردوەو شتێکیان لەو بارەیەوە نەزانیوەو نەوتووە.

هەر ئەو ئەفسانەو خەیاڵاتە بوو کە بوو بەهۆی سەرگەردانی شیعە لەسەرتاسەری مێژووداو ئەمڕۆش نازانێ بەرەو کوێ مل دەنێ..!!